# دۆزی ئافرەت



ێوان ئازاد کردن و بەسەنتەر کردنی مێینەدا

## فیمینیزم

نووسینی
د. عبدالوهاب المسيرى

وەرگێڕانی
فـاتح سەنگـاوی

# دۆزی ئافرەت

## لەنێوان ئازادکردن و بەسەنتەرکردنی مێینەدا

((فیمینزم))

نوسینی

د.عبدالوهاب المسیری

وەرگێرانی

فاتح سەنگاوی

# دۆزی ئافرەت

## لەنێوان ئازادکردن و بەسەنتەرکردنی مێینەدا

((فیمینزم))

نوسینی

د.عبدالوهاب المسیری

وەرگێڕانی

فاتح سەنگاوی

---

١٤٢٣ك

٢٠٠٢ ز

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

### ووتەیەك

ئەم نوسراوەی د.عبدالوهاب المسیری توێژینەوەیەكی گرنگ و جیدی‌یە سەبارەت بە بزاڤی فیمینزم ، كە نوسەر بە بزاڤی بەسەنتەركردنی مێینە ناوزەدی دەكات ، لەم توێژینەوەیەدا نوسەر دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕیشە و بنەمایانەی ئەم بزاڤەی لەسەر ڕۆنراوە و قسەش لەوە بكا كە سەرەنجام و ئایندەشی بەچ ئاقارێكدا دەڕوا و چی پێ دەكرێ بۆ دۆزی ئافرەت و كێشەی مێینە و كاریگەریشی چی دەبێ سەبارەت بە كۆمەڵگە بەگشتی و توێژی ئافرەتان بە تایبەتی ، هەر لەم میانەیەش دا پێگە فیكری‌یەكانی ئەم بزاڤە دەخاتە ڕوو، جیاوازی‌یەكی ئاشكراش دەكا لە نێوان ئەم بزاڤە و بزاڤی ئازادكردنی ئافرەتان و داكۆكی كردن لە مافەكانیان ، كە بە (حركة التحرير المرأة) ناسراوە ، ئەوەشی ڕووی زانستی و بابەتی بونی ئەم توێژینەوەیە دەخاتە ڕوو قوڵ بوونەوە و قاڵ بونەوەی نوسەرە لە نێو فیكری ڕۆژاوادا بەگشتی و دۆزی ئافرەتیش وەك بابەتێكی خاوەن ڕیشەو ئاوكێش ، بگرە نوسەر خۆیشی خۆی بە ئاڵا هەڵگری داكۆكی كردن لە مافەكانی ئافرەت زانیوە و سەردەمانێكیش خولیا و خەمێكی تایبەتی بووە و ئێستەش دەیەوێ بەدیدێكی هاوسەنگ و پاش خانێكی بەهێزەوە بۆ ئەم دۆزەی بڕوانێ و ئەلتەرناتیڤێكی بەهێزتر لەم بارەوە بخاتە ڕوو. ئەمە جگە لەوەی نوسەر لە بوارەكانی تردا جێ دەستی دیارەو خاوەنی دەیان كتێب و توێژینەوەی زانستی ترەو كەسێكی ئەكادیمی و ڕۆشنبیرێكی ناسراوە.

ئەوەش پەیوەندی هەیە بە كۆمەڵگەی خۆمانەوە بەڕای من وەرگێڕانی نوسراوێكی وا گرنگی‌یەكی تایبەتی دەبێ وچینی ڕۆشنبیران و ئافرەتانیش بەتایبەت سودمەند دەبن لێی ، لەلایەكەوە دید و ڕوانگەیەكی ڕەخنەیی‌یە بۆ بزاڤی فیمینزم و دەروازەیەكە بۆ ناسینی زیاتری ئەم بزاڤە و لەلایەكی ترەوە كوردستانی خۆیشمان بێ پشك نەبووە لە كاریگەری ئەم بزاڤەو بانگەشەكارانی ، بە تایبەتی ئێستاكە هەروەك (ناسك قادر) لە هاوولاتی ژمارە (٦٢ ی٢٠٠٢/٣/٤)دا دەڵێ (لەگەڵ ئەوەی فیمینزم چەند باڵێكی هەیە ئەو باڵەی خەریكە بۆ كوردستان دەبرێتەوە بریتی‌یە لە ڕادیكاڵ فیمینزم كە جگە لە ڕقی ئافرەت لە خۆی و لەپیاو چیدی نی‌یە).

كەواتە دەكرێ ئەم جۆرە نوسینانە ڕۆڵی خۆیان لە پانتایی ڕۆشنبیری كوردا ببینن و خستنە ڕووی ڕوانگەیەكی تایبەت بن لەسەر ئەم بزاڤە ، بەهیوای ئەوەی ئەم وەرگێڕانە كە لێنێك پڕبكاتەوە –ئەگەر كەمیش بێت– لە كتێبخانەی كوردی پڕ و بابەتی جیدی تریشی بە دوادا بێ.

وەرگێڕ

٢٠٠/٣/٧

چەمچەماڵ

## ١-لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤی سروشتی دا

یەکێك لەمەسەلە باوەکانی ئێستامان لەئامێز گرتنێکی گەرم و گوڕ و بێ وێنەی زۆربەی ئەگەر نەڵێین هەموو ئەوانەیە کە لە ڕۆژئاواوە بۆ مان دێ، بەبێ ئەوەی هەوڵی شیتەڵ کردن یا ڕاڤەکردنی بدەین، وە بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەین ئەوەی کە لەوانەوە بۆمان دێ ڕوانین و دید و لایەنگیری ئەوانمان بۆ دەخاتە ڕوو (هەروەك لە هەموو شتێکی مرۆڤانەدا پێش بینی دەکرێت) هەر بۆیە نائامادەیی‌یەکی تێبینی کراو بەرچاو دەکەوێ لە ڕەهەندی ڕەخنەیی لە توێژینەوە عەرەبی و ئیسلامی‌یەکاندا بۆ چەمك و زاراوە ڕۆژئاوایەکان.

چونکە ئێمە تەنها بەوەندە واز دەهێنین کە بیر و هزریان لە دید و بۆچوونی خۆیانەوە بگوازینەوە ، بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێکیان ئاڕاستە بکەین کە لەدید و ئەزمونە مێژوویی و مرۆیەکانی خۆمانەوە هەڵقوڵابێ ، وەبەبێ ئەوەی ڕووە و ئەو بابەتە هەمەکی و کۆتاییە شاراوانەی ئەو دەقانە بڕوانین ، کە دەیهێنین و ڕاڤەی دەکەین ، هەر بۆ نمونە ئێمە ناپرسین ، لەوەی ئەو مرۆڤەی کە لە دەقە گواستراوەکاندا خۆی دەنوێنێ پێکهاتەیەکی مادی‌ی سادەی هەیە یا خود پێکهاتەیەکی ئاڵۆزەو ماددە تێ دەپەڕێنێ؟ وە ئەم مرۆڤە لە کوێوە وە پێوەرێتی خۆی بەدەست دەهێنێ : لە یاساکانی جووڵەوە یا لە شتێکی ئاڵۆزتر لەوە؟ ئایا ئامانج و مەبەستێك لە ژیانی مرۆڤ دا هەیە یاخود ژیانی بەرەنجامی ڕێکەوت و ئازادی‌یەکی کوێرانەیە؟ لە کۆتاییش دا ، ئایا مرۆڤ چەقی بوونەوەرو دەتوانێ جیهانی ماددە تێپەڕێنێ ، یاخود پێکهاتەیەکەو هیچ گرنگی‌یەکی نی‌یە و مل کەچە بۆ بارودۆخە ماددییەکان و حەتمیەتەکانی سروشت؟

بێ توانابیمان لە پێناسەی ڕەهەندەهەمەکی و کۆتایەکان دا ئەو هۆکارە شاراوەیەیەکە لە پشت تێکەڵ کردنی چەمکەکاندا تێبینی دەکرێ ، وەك دەبینین پۆلێن دەکرێنەوە یا پێکەوە دەبەسترێن یا جیا دەکرێنەوە لەسەر چەند بناغەیەکی ڕووکەش، لە لێکچو و جیاوازیەکان.

لەم دووایانەدا زاراوەی (فیمینزم Feminism ) سەری هەڵداوە و بۆ ((النسويه)) یا ((النسوائيه)) یا ((الانثوية)) وەردەگێردرێ ، کەئەمەش وەرگێڕانێکی حەرفی‌یەو کەڵکێکی وای نی‌یە و برسێتی برسیان تێر ناکاو ڕوونی نابەخشێ بە هیچ چەمکێك کە لە پشت ئەم زاراوەیەدا شاراوەبێت ، لەوانەیە سوود لەوەدا بێ لە هەوڵی دەست نیشان کردنی ڕەهەندێ هەمەکی و کۆتایی ئەم زاراوەیەدا بین تاماناا پێکهاتەیی و ڕاستیەکەی هەست پێبکەین، وەبۆ

جیبەجێ کردن و (تەواوکردنی – و–) ئەمەش گەرەکە زاراوەکە لەناو کۆیەکی بەرینتردا دابنێین ، کەئەمەش ناو دەبرێ بە ((بیردۆزەی مافە نوێیەکان – نظرية الحقوق الجديدة)) .

زۆربەی بزووتنەوە ئازادی خوازە ڕۆژئاوایەکانی چاخی پاش مۆدێرنیزمە (چاخی بالادەستی شمەك و نامۆبوونی چەق و بەتوانایی لەسەر تێپەڕاندن و داڕووخانی سەرجەم جێگرو هەمەکیەکان بۆ ژێر ڕکێفی ناجێگیرەکان تەواو جیایە لەو بزووتنە ئازادی خوازە کۆنانەی لە دیدێکی مرۆڤ دۆستی (هیومانیەتەوە) دەیڕوانی و لەدەوری مرۆڤ چەقی دەبەست.

نوسەری ئەم توێژینەوە یە لە چەمکێکی مەعریفیسەرەکیەوە هەنگاو دەنێ ، کەبریتییە لەوەی لەچەندەها شوێن دا جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لە نێوان مرۆڤ و سروشت دا ، کە مرۆڤ لەناخی دا هەڵگری پێکهاتەیەکی وایە کە بتوانێ جیهانی سروشت/مادده تێپەڕێنێ ، بەتواناییش لەسەر ئەم تێ پەڕاندنە لەیەك کات دا هۆ و ئەنجامی چەق بوونی ئەوە لەم گەردوونەدا .

مەنزوومەی مۆدێرنەو عەلمانیەتی ڕۆژئاوایی لەو بازنەیەدا دەخولێتەوە کەناومان ناوە بە (الحلولية الكمونية المادية – توانەوەو شاراوەیی مادده)) . یا خودمەرجەعیەتی لە خۆدا شاراوە یاخود ((المرجعية الكمونية الذاتية)).

وە ئەو جیاکارییانەی ئەم مەنزوومەیە دەیکا ، لەسەر ئاستی بنیاتی گشتی ، کە تاکە بنەمای ڕێکخەری ئەم گەردوونە جیا نییە لێی و بە دوور نییە پێی . یا تێی پەڕێنێ ، بەڵکو شاراوە و ئاوێتەیە تیایدا ، هەر بۆیە گەردوون (مرۆڤ و سروشت) خۆی دەبێتە مەرجەعیەتی خۆی ، و پێویستی هەر بە خۆیەتی. ئەمەیە ئەو بنەما بنیاتیە گشتییە یا نمونە جێگیرە شاراوەیە ، بەلام ئەم نمونەیە شێوازێکی ڕیزبەندی وا وەردەگرێ کە بەپێی سەردەمەکان جێبەجێ دەبێ و شێوەی چەند بازنەیەك وەردەگرێ کەهەریەکەیان بەدوای ئەوی دیدا دێ، کەدەکرێ بەم شێوەی دادێ پوختی بکەینەوە:

١–تاك ڕەهەندی* مرۆڤانە ((هیومانیەت)): ڕیز بەندی مۆدێرنەو عەلمەنە لێرەدا لە وێوە دەست پێ دەکا کە مرۆڤ ڕاستەو خۆ ڕووبەڕووی بونەوەر ببێتەوەو ڕای بگەیەنێت کە

* تاك رەهەندیمان لە بەرامبەر (الواحدية) دا وەرگێڕاوە کە دەکرێ بە (تاکایەتی/یەکانەیی..هتد) وەری بگێڕین بەلام ئەوەی سەرەوەمان بۆ ئەم کتێبە بە تەواو تر زانی . (وەرگێڕ)

خۆی سەردار و چەقی بوونەوەرە و جێگەی چارەسەرییەکانە ، هەربۆیە خۆی مەرجەعی خودی خۆیەتی و هەر لە خودی خۆیشیەوە پێوەرێتی وەردەگرێ .

وە لەڕوانگەی ئەم گریمانەیەوە ، ئەم مرۆڤە لە هەوڵی تۆخ کردنەوەی کرۆکی مرۆییانەی خۆیەتی (بە جیا لە سروشت)و دەیەوێ (سروشت/مادده) بەهێزی ویستی خۆی تێ پەڕێنێ و خودی مرۆییانەی خۆی بە سەریا دەسەپێنێ،واتە بە ناوی سەرجەم مرۆڤایەتییەوە .

٢- تاك ڕەهەندی (ئیمپریالی) : ئەو مرۆڤەی دەیەوێ جەخت لەسەر کرۆکی مرۆڤانەی خۆی بکاتەوە بەناوی هەموو مرۆڤێکەوە دەدوێ ، بەڵام لەنائامادەیی هەر مەرجەعیەتێك دا کە خودی تاکی تێپەڕێنێ ، مرۆڤێکی داخراو دەبێ بەڕووی خۆیدا ، تا لەسەرەخۆ و پلە پلە دەبێتە تاکێکی وا کە تەنها بیر لە بەرژەوەندی و چێژەکانی خۆی دەکاتەوە و ئاماژەش بە خودی مرۆڤایەتیانە ناکا بەڵکو بۆ خودی تاکی خۆی دەکا. ئا لەو کاتەدا خودی تاکی ی خۆی ، جێ ی چارەسەرکردنە نەك ((سەرجەم مرۆڤایەتی)) (لێرەوە –و–) مرۆڤی تاك لەبەرامبەر سروشت و ئەوانی تردا خۆی دەکا بە خواو دەبێتە مرۆڤێکی ئیمپریالی. وەکاتێ ئەو مرۆڤە ئیمپریالیە پێوەرێتی خۆی لەخودی ئیمپریالیەتیەوە وەردەگرێ کە بە دوور خستنەوەی ئەوانی دییە ، ئەو کاتە مرۆڤ دەبێتە ڕەگەز پەرست و لەهەوڵی بەکۆیلەکردن و بەکارهێنانی ئەوانی دیدایە ، بەڵکو خودی سروشتیش بەکاردەهێنێ بۆ بەرژەوەندی خۆی ، لێرەوەش دوا لیزمەی جێگیر ، دوالیزمەی من و ئەوی دی بەدەردەکەوێ .

٣- دوا لێزمەی مرۆڤ و سروشتی چەسپاو و نەگۆڕ *

پاش قۆناغەکانی پێشوو کە تایبەتمەند بوو بە چەقبوون بەدەوری خودی مرۆییانە (جا چ لە ڕێگەی مرۆییانەی هیومانیزمەوە بێ یا لە ڕێگەی ڕەگەز پەرستانەی ئیمپریالییانەوە بێ) مرۆڤ لەسەرە خۆ ئەوە دەدۆزێتەوە کە (سروشت/مادده) ش جێگەیەکی تری چارەسەرەکانە ، وەهەروەها خۆی مەرجەعیەتی خۆیەتی و پێویستی تەنها بە خۆی دەبێ....

---

* دانانی ووشەی چەسپاوو نەگۆڕ یا جێگیر لە بەرامبەر (الصلب) وە ناجێگیر لە بەرامبەر (السائلة) دانانێکی نزیك (تقریبی)ن چونکە ئەمانە چەمك و زاراوەن لە گەڵ خۆیدا ماناکەی هاتووە (وەرگێڕ) .

دوانەیی و دووو پێوەریەکی جێگیری تر بە دەردەکەوێ ، دوو پێوەری مرۆڤێك کەچەقی بەستوە بەدەوری خۆیداو-بنکەی گەردونی داگیر کردووە، لە بەرامبەر سروشتێکەوە کە تەنها پێویستی بە خۆیەتی و بنکەی گەردونی داگیرکردووە.

**٤-یەك ڕەهەندی چەسپاوو نەگۆڕ(الواحدیة الصلبة):** هەر بەزووی ئەم دوو پێوەرێتییە هەل دەوەشێتەوە و (سروشت/مادده) دەبێتە جێی چا ڕەسەکان و تاك ڕەهەندی (سروشت/مادده) جێی تاك ڕەهەندی مرۆیانە دەگرێتەوە .. لێرەدا کرۆکی مرۆیانە ووردە ووردە دەست بە وون بوون دەکاو سروشتێتی جێی مرۆیانە دەگرێتەوە ، مرۆڤیش پێوەریتی خۆی لە (سروشت/ مادده)ەوە وەردەگرێت نەك لە خودی خۆیەوە ، ئاوێزان بوونی بەسروشت زیاد دەکات تا بەتەواوی تیایدا دەتوێتەوە توانەوەی بەش لە گشت دا .

لەو کاتەدا مرۆڤی سروشتی بەدەر دەکەوێت کەتەنها بەناو مرۆڤە، مرۆڤێك کە کرۆکی (سروشت/ مادده)یە ، نەك مرۆڤانە، چۆن مل کەچی سروشتەو شوێنی یاساکانی دەکەوێت ، پاش ئەوەی ئاماژەی بەخودی(مرۆیی/تاکی) خۆی دەکرد ، بووتە بەشێکی دانەبڕاو لەسروشت و ئاماژەی پێدەکا ، واتە لایەنە مرۆیانەکەی هەڵدەوەشێتەوەو بەتەواوی دەبێتەوە سروشتی بەم شێوەیە مەقولەی مرۆڤ و بیری سروشتی مرۆیانەی جیا لەیاساکانی مادده ڕوو لە پوکانەوە دەکا ئەوەی ئەندازەیەکی مەعقول جێگیری و بەردەوامیەتی پێوە دیارە ، واتە ئێمە لەجیهانێکی دووالیزمەوە و کێشمە کێشمەوە ، کە چەقەکەی مرۆڤ یا سروشتە دەیگوێزینەوە بۆ جیهانێکی یەك ڕەهەندی کە چەقەکەی تەنها (سروشت/ مادده)یە: ئەووی شایەنی تێبینییە ئەم جیهانە — سەرەڕای نامرۆیی بوونەکەشی — جیهانێکی خاوەن چەقە (لۆجۆسەنتریك — Logo centric)ە لە زارەوەی پۆست مۆدیرنەدا) هەر بۆیە ڕەنگرێژە بەوەی ناوی دەنێین ( بەتاك ڕەهەندی جێگیرو چەسپاو) .

**٥- تاك ڕەهەندی ناجێگیر (الواحدیة السائلة):**

هاوکێشەی شیکردنەوەو هەڵوەشاندەنەوەکانی ڕوو لە هەڵکشان دەکاو بنکەی چارەسەرەکان فرە دەبن ، تا وای لێ دێ گۆڕان دەبێتە چەقی چارەسەرەکان ، ڕێژەیی بوون دەبێتە تاکە ڕەها و گۆڕان دەبێتە تاکە خاڵی جێگیر ئا لەو کاتەدا (سروشت/ مادده) چەقێتی خۆی لە دەست دەدات بەو پێ یەی کۆتا مەرجەعیەت بێ .

لەکۆتایشدا هەموو یەقینێك وون دەبێت و ڕێژەیی بوون بەتەواوی زاڵ دەبێ و فرە چەقی ڕوو دەدات وەهەموو شتێك دەکەوێتە ژێر چنگی گۆڕانی تەواوەوهەموو ئەمانەش کێشمان دەکەن بۆ جیهانێکی لێك هەڵوەشاوی بێ بنکەو جیهانیش دەگوڕێ بۆ یەك پێکهاتەی گشت گیر کە هەموو لایەنەکانی بەتەوای یەکسان بن بە چەقەکەی ، جیهانێك لووتکەو بنکەو ڕاست و چەپ و (یا نێر و مێ ی)تیادا نەبێ ، بەڵکو ڕووکارێکی ڕوو تەختی وا وەردەگرێ کە سەرجەم بوونەوەرە مرۆیی و ڕەوشتی‌یەکان لەسەر هەمان ڕوو دەوەستن و هەموو دوا لیزمەکانی تێدا پاکتاو دەکەن هەموو (دال) ەکان لە (مدلول)ەکان جیا دەکرێتەوەو بە بێ ڕەگ و ڕیشەومەرجەعیەت و بنەما دەخولێنەوە بەم شێوەیە ووشەی (مرۆڤ) دەبێتە (دال)ێکی بێ (مدلول) یا (دال)ێکی فرە (مدلول) ، ئەمش لەیەك هەڵوەشسانێکی تەواوەو بریتی‌یە لە گواستنەوەی دوالیزمەی چەسپاوو نەگۆڕو تاك ڕەهەندی چەسپاوو نەگۆڕ بۆ ئەو تاك ڕەهەندەی ناجێگیرە (الواحدیة السائلة)ی کە سنورو کۆت و بەندی بۆ نی‌یە .

هەر ئەمە لە هەمان کاتدا گواستنەوەیە لە جیهانی بە مودێرنەکردنو مۆدێرنەوەو (ئیمپریالیەتەوە) بۆ چاخی پاش مۆدێرنەو (سستمی نوێ ی جیهانی).

سەرەڕای ئەو جیاوازییە مەعریفی و فەلسەفی‌یەی لە نێوان تاك ڕەهەندی چەسپاوو نەگۆڕ و تاك ڕەهەندی ناجێگیر دا بەدی دەکرێ ، کە چی دەکرێ بڵێن خاڵە لەیەك چووەکانیان — لەدیدگای ئەم باسەوە– گرنگترن لە خاڵە جیاوازەکان ، چونکە ناوەڕۆك و کرۆکی هەردووکیان وونبوونی مرۆیانە و لێك هەڵوەشان و پوکانەوەیەتی (هاوکات لەگەڵ ) توانەوەی لە جیهانێکدا کە چەقەکەی سروشت یا جیهانێکی بێ چەقە .

ئەم مۆرکە (تاك ڕەهەندی هیومانی(جیهانێك چەقەکەی سەرجەم مرۆڤایەتی مرۆیانە بێت)و تاك ڕەهەندی ئیمپریالی (جیهانێك چەقەکەی خودی تاك بێت) —دوالیزمەی چەسپاو نەگۆڕ (ملـ ملانێ ی نێوان مرۆڤ و سروشت) و —تاك ڕەهەندی چەسپاو نەگۆڕ (جیهانێك چەقەکەی سروشت بێت) و تاك ڕەهەندی نا جێگیر (جیهانێکی بێ چەق کە لەنێو چەپۆکی گۆڕاندندا بێ) ئەوە مۆرکێکی سەرەکی بیری ماددی یە هەر لەسەرەتای بیرکردنەوەی فەلسەفیەوە . بەڵام بە شێوازێکی بن گرتوو لە فەلسەفە ماددیەکانی چاخی نوێ دا بەدەر دەکەوێت ، هەر بۆیە پاش قۆناغێکی هیومانی سەرەتایی کورت (Humanism) ئیمپر یالیەت بەدەردەکەوێت، پاشان

ڕەگـەز پەرسـتی و دوژمنکاریـەکی قـوڵ بەرامبـەر مـرۆڤ ( Anti Humanism) دێ بەدوایدا).

وەمرۆڤ بە پێی پێوەری نیتشە دابەش دەکرێ بۆ سۆپەرمان(Super man) واتە پیـاوی باڵا ، یا ئەو مرۆڤەی مرۆیی تێپەڕاندووە ، وە سبمان (Subman) واتە نزمە پیاو ، یا ئەو مرۆیەی لە خوار مرۆڤەوەیە.

بەم شێوەیە جیهانێکی پڕ مل ملانێ ی دووانەیی بەدەر دەکەوێ (کە تیایدا) مرۆڤەکان دابش دەبن بۆ:

سەر بڕو سەر بڕاو – بکوژ و کوژراو – بەهێز و لاوازەکان– دڕندەو نەرم و نیان و خۆگونجێن.

بەڵام ئەوەی کۆکەرەوەی هەریەکە لە سۆپەرمان و سبمانە ئەوەیە هەریەکـەیان دەربڕی کرۆکـی مرۆییانەیـەکی وەهانیـیە کـە (سروشـت/ مـاددە) تـێ پـەڕێنێ، بـەڵکو بەشـێکە لـەو جیهانـە (سروشت/ مـاددە) داروینیەیـەی (خولقێنـەری) ململانێیـەکی تـاك ڕەهـەندی چەسـپاوو نـەگۆڕ (واحدي الصلب)ە.

لە پێشینی (الأسبقية) ی (سروشت/ ماددە) بەسەر مرۆڤ دا خۆی ڕاڤە دەکا بۆ لە پێشێتی تاك بەسـەر کۆمەڵگەو بەرژەوەندی کەسایەتی و سوودی تاکەکەسـی بەسـەر بـەهاکانی کۆمەڵگـەو داواکاریـیەکانی مانەوەی.

ئەم جیهانە خاوەنی جوڵەیەکی بەردەوامە ، هـەر بۆیە زۆر خێرا ئەم جێهانە خاوەن دوا لیزمە جێگیر و تاك ڕەهەندە جێگیر هەڵدەوەشێتەوەو دەبێتە جیهانێکی بێ چەق و بنکە لە حاڵەتێکی نا جێگیری تەواو دا ، هەر بۆیە (دریدا) جێی نیتشە دەگریتەوەو (مادۆنا) و (مایکڵ جاکسۆن) شوێنی (تەڕەزان و دراکیولا) دەگرنەوە.

## ٢-یەکسانی و یەکسان کردن

دەتوانین بڵێین پێگەی دەرچوونی بزافە ڕزگاری خوازە کۆنەکان تاك ڕەهەندی مرۆیانە (هیومانیەت) بوو ، لەو باوەڕەوە سەچاوەی گرتبوو کە مرۆڤ جیایە لە سروشت و زاڵە بەسەریداو هەر خۆیشی چەقی سروشتەو دەتوانێ تێی پەڕێنێ و دایڕێژێتەوە.
داخوازیەکانی یەکسانی نێوان مرۆڤەکان لەم بازنەیەدا بەئەنجام دەگەیشت بەشێوەیەك مرۆڤ لە لوتکەی هەرەمی گەردوونی دا بێ و بوونەوەرێکی ئازادی داهێنەری بێ وێنە بێ .
بەڵام بزافە رزگاری خوازە نوێیەکان لەم گریمانە فەلسەفیە مرۆیانەوە سەرچاوە ناگرن ، بەڵکو بەشێوەیەکی هۆشیارانە یا نا هۆشیاریانە ڕەتی دەکەنەوە ، چۆنکە ئەوان بزافێکن پەسەندی دەکەن تاك ڕەهەندی ئیمپریالی (مرۆڤ لە ململانێی برا مرۆڤەکەیدا بێت) و لە بازنەی دوا لیزمەی جێگیردا دەسوڕێتەوە (جەنگی مرۆڤ دژ بەبرا مرۆڤەکەی و دژ بە سروشتیش) وەتاك ڕەهەندی جێگیر (سەرداریی سروشت بەسەر مرۆڤداو خزاندنی مرۆڤ لە چەقی گەردوون) و تاك ڕەهەندی ناجێگیر (ڕەتکردنەوەی بیری مەرجەعیەت و چەق و هەر جێگیر و هەموانیەك ، لەناو ئەوانەشدا چەمکی مرۆیانەی هاوبەشی بەتوانا بەسەر تێپەڕاندنی (سروشت/ مادده) دەکات).

ئەم بزافە نوێیانە بە شێوەیەکی زۆر توند ڕەوانە جەخت لەسەر فکرەی مل ملانێ دەکەنەوە ، سەرجەم شتەکان لەدیدی ئەواندا دەربڕی هاوسەنگیەکانی هێز و بەرهەمی ململانێیەکی بەردەوامە ، مرۆڤیش تەنها بوویەکی سروشتی‌یەو دەکرێ بیگێڕینەوە بۆ (سروشت/ مادده) و دەشتوانێ یەکسانی کەی بە بونەوەرە سروشتیەکان لە ڕاستیدا مرۆڤ یەکسان دەکرێ بە گیاندار و ڕوەك و شتەکانی تر تا وای لێ دێ هەموو شتەکان بەیەکتری یەکسان دەبن ، لێرەوە چەقەکان فرە دەبن و یەقین لەدەست دەدرێ سەرجەم شتەکان دەکەونە چنگی گۆڕاوەکانەوە پاشان حاڵەتێکی دەست نێشان نەکردن و ناجێگیری و فرەیی‌یەکی زیادەڕۆ بەدەر دەکەوێ .
لەم چوا چێوەیەدا دەکرێ هەموو شت مل کەچی ئەزموون کاریەکی بەردەوام بێ بەدەر لەهەر سنوور یا چەقێکی پێشینەوە (تەنانەت ئەگەرمرۆڤایەتی هاوبەشیشمان بێت کە بەدرێژای مێژوو بەدەست هاتووە).
سەرەتای توێژینەوە لە چەند (شێوازێکی) نوێی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان دەست پێ دەکات کە بەرچاو ڕوون نی‌یە بە ئەزموونە مرۆیی‌یە مێژووییەکان ، وەك ئەوەی ژێری مرۆ لە ڕاستی‌دا

لاپەڕەیەکی ماددی سپی بێ، یا وەك ئەوەی هەڵگری قورسایی هۆشیاری مرۆی مێژوویانەی خۆی نەبێ، وەك ئەوەی ›(ئادەم)ی پێش چرکە ساتی دروست بوون بێ، پێش ئەوەی خوای گەورە گیانی بەبەردا بکا ، تەنها پارچە قوڕێك بێت کە بتوانی بە هەر شێوەیەك دا بڕێژرێ و جیاوازی نەبێ لە نێوان ئەوو نێوان هەر ڕەگەزێکی (سروشتی،ماددی) تر.

هەر بۆیە دەبینین کۆمەڵە ئازادی خوازە نوێیەکان (کە ئازادن لە هەر چەمکێکی مرۆییانەی هاوبەش و قورساییەکانی مێژوو ، بەرگری کردن لە ئەزمونێکی کراوەی بەردەوام) بەرگری دەکا لە هەژارو ڕەش پێست و نەشازە سسێکسیەکان ودارو درەخت و مافی ئاژەڵو منداڵو ڕەش و ڕووتان و تلیاك خۆرو بێ هۆش و مافی خۆکوشتن و ، وەلەوەی دێ بەخەیاڵدا یان نایەت.

وە لەوانەیە بڵاوبونەوەی ماددیەتی جێگیر (المادیه الصلبه) و نا جێگیر(السائلة) لە چاخی نوێدا (کەوا دەبینێ ئەم جیهانە لە یەك کرۆك پێك هاتووە جیاوازی لەنێوان مرۆو سروشت دا نی‌یە ) ئەوە بێ ڕاڤەی نهێنیی بڵاوبوونەوەی ئاینە سروشتیو پەرستشە نوێیەکان بکا لەناو ئەوانەش دا پەرستنی شەیتان و هەواداریە گەردونی‌یەکان، سەرجەم ئەمانە بانگەشەن بۆ جەخت کردنەوەی پێشینی سروشت بەسەر مرۆو تاك بەسەر کۆمەڵدا ، وە بانگەشەی مرۆ دەکەن بۆ توانەوە لە سروشت داو هەڵوەشانەوەی قەوارەی مرۆڤ وەك چەقێك کە سنورێکی سەربەخۆی هەبێ، بۆ هەڵوەشاندنەوەی چەمکی مرۆڤ و بی ناوەڕۆك کردنی ، پاشان سەرەنجامی کاروباری ئەم بانگەشانە بەڕەتکردنەوەی بیری جیهانێکی پێکەوە بەستراو بەدەوری چەقی خودا خولاوە کۆتای بێ ، تا جیهانێکی بێ چەق و ناجێگیر جێی بگرێتەوە .

پەسەند نەکردنی مرۆڤ بۆ پشتگیری ئەم بانگەشەی باوەڕ بە لەپێشی تاك بەسەر کۆمەڵگەو یەکسانی کردن لەنێوان مرۆو سروشت دا بەکردەوەیەکی کۆن خوازی و ڕەت کردنەوەی پێشکەوتن دادەنرێت (لە دیدی بیردۆزەی مافە نوێیەکانەوە ) لەگەڵ ئەوەی ئەم هەڵوێستی پەسەند نەکردنە لە واقیع دا هەوڵێکی گەڕانەوەیە بۆ بیری مرۆڤێکی کۆمەلایەتی ، ژیاری ، سەربەخۆ لەسروشت و بە توانا لە تێپەڕاندنی ، خاوەنی ویست و هۆشیاری ، کە ئەمەش پەسەند نەکردنی ئەوحاڵە سروشتی‌یە ماددی‌یە (ئاژەڵییە)یە وە یەکسانی مرۆو یەکسان کردنێتی بە ئاژەڵ ، وە بەرگری‌یە لە لەپێشی کۆمەڵگە بە سەرتاك و چەقێتی مرۆیە لەم گەردونەدا.

لەم چوارچێوەیەدا ، دەتوانین چاوێك بخشێنینەوە بەم بەرگرییە زۆر ناهەموارەی لە نەشازی سێكسی دەكرێ، ئەم(بەرگرییە-و-) لەكرۆكی دا بانگەشە نییە بۆ لێبوردەیی یا تێگەیشتنی ئەوانەی تووشی باری نەشازی سێكسی هاتوون (هەروەك دەكرێ لەسەرتاوە بۆ هەندێك وا دەربكەوێ ) بەڵكو ئەمە بانگەشەیە بۆ ئاسایی كردنەوەی نەشازی سێكسی،واتە بكرێت بەكارێكی سروشتی وئاسایی ، ئەمەشە وای لێكردوە كە بووەتە مایەی هێرش كردنە سەر سروشتی كۆمەڵایەتیانەی مرۆو مرۆڤایەتی هاوبەشمان وەك مەرجەعیەتێكی كۆتایی و پێوەرێكی جێگیر كە دەكرێ لە زەمینەیدا بوەستین و بڕیاری مرۆڤانەی لێوە دەركەین و دەست نیشانی كەین كەچی مرۆڤانەیەو چیش مرۆڤانە نییە، واتە نەشازی سێكسی تەنها دەربڕینێك نییە دەربارەی مەزاجێك یا(لادانێك)ی تاكە كەسی ، بەڵكو گۆڕاوە بۆ ئایدۆلۆژیەتێك كە دەیەوی دووانەیی سەرەكی مرۆییانە(نێر/مێ) هەڵوەشێنێتەوە ، كە ئاوەدان خوازی و پێوەری مرۆییانە پشتی پێ دەبەستێ .

قسەكردنی یەكجار زۆرو ئاڵۆز هێن دەربارەی (مافەكانی مرۆڤ) كە بە پێشەوایەتی و پاڵپشتی و یارمەتی دانی ئیمپریالیترین وولاتانی جیهان كە وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە بە ڕێوە دەچێ ، لە كرۆكیا هێرشە بۆ سەر چەمكی مرۆیانەی هاوبەشمان.

ئەو مرۆڤەی دەربارەی مافەكانی قسە دەكەن یەكەیەكی سەربەخۆو سادەی ژمارەییە و تاك ڕەهەندە ، نە كۆمەڵایەتییە نە ژیاری ، پەیوەندی نییە بە خێزان یا كۆمەڵگە یا دەوڵەت یا مەرجەعیەتی یەكی مێژوویی یا ڕەوشتیی .

ئەو كۆمەڵە پێویستییەكی (ماددی) سادەی ڕووتە كە قۆرخكاران و كۆمپانیاكانی ڕاگەیاندن و ئارایشتگەكان و پیشەسازییەكانی چێژو بەرەڵڵایی دەستنیشانی دەكەن (لە كۆتایی كاردا پیشەسازی چەكەمەنی كە گرنگترین پیشەسازییەكانی چاخی نوێیە و لە هەموویان زیاتر لە ناوبەرو هەڵوەشێنەرترە سەرەنجامی دیاری دەكەن).

تاك بە پێی ئەم تێڕوانینە بە تەنهایی دەمێنێتەوەو دەبێتە وەرگری ژمارەیەك ئامارەی حسسی سادەو چڕی ئەم دەزگا گشتییانەی تایبەتمەندی نییە و هەڵگری هیچ بەهایەك نییە تەنها فیكرەی بە گەورە گرتنی چێژی بەكار براوو زیاتر كردنی سودی كۆمپانیاكان نەبێ .

تاك تەنها مرۆڤێكی سروشتییە شتێكی سروشتی/ماددی لە نێوان شتە سروشتییە/ماددیەكاندا و دەرهاویشتەی ڕاستەوخۆی چەمكی گرێ بەندی كۆمەڵایەتی بۆرژوازی یە ، كەوا دەبینێ تاكی سروشتی لە پێش ترە لە كۆمەڵگایەكی ناسروشتی ، كە ئەو گرێ بەندییە لە

نیوەی سەدەی نۆزدەدا گۆڕا بۆ گریٚ بەندی نا کۆمەلاّیەتی داروینیـی ، کە گریمانەی جەنگی هەموو بەرامبەر هەموو دەکا ( هەروەك گەورە فەیلەسوفی بۆرژوازی تۆماس هوبس لە چاخی ((ڕێنیسانس)) لە ڕۆژاوا پێشبینی کرد).

هەربۆیە کەس باس ناکادەربارەی مافی مرۆڤی (کۆمەلاّیەتی )و کۆمەڵگە مرۆییەکان لە مانەوەیان لەنێو مەنزومە بەهاییەکانیان و تایبەتمەندیە نەتەوەیییەکانیان، وە هیچ کەسێك کێشەی ئەو پیشەسازی یە بەرەلاّییە و شمەکە جۆراو جۆرانە ناخاتە روو کە لەلایەن ڕۆژاواوە دادەهێنریٚ و سادەترین مافە مرۆییەکانی بەهەدەر دەدریٚ و مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ شتێکی کەمی ماددی و هیچ پیرۆزییەکی نامێنیٚ.

هەروەها کەسیش مشت و مڕی مافی ئەو گەلانە ناکات کە سەروەت و سامانیان تالاّن دەکریٚ و دەدزریٚو پاشان لە لایەن کەسانێکی سەر بەو حکومەتانەوە کە شەووو ڕۆژ باس لە داوای پاراستنەکانی مافی مرۆڤی تاك دەکەن لە بانکەکاندا دادەنریٚ .

وە هیچ کەسیٚ داوای وەستانی پیشەسازی چەکسازی کاول و وێران کار ناکا کە زۆربەیان لە جیهانی ڕۆژاوادا گەشەی پێدەدریٚ و دروست دەکرێت و میزانییەی گەلانی تری پیٚ دەمژریٚ و ژینگەی پیٚ پیس دەکریٚ و سالاّنە بەهەزاران کەسی پی لەناودەبریٚ .

قسەکردن بەردەوام دەربارەی مرۆڤێکی دابڕاوی سادەیە کە لەناو کۆمەڵگەو مێژوو ژیارو خێزان دا بوونی نییە ، لەگەڵ ئەمەدا قسەکردن سەبارەت بە مافە ڕەهاکانی ئەم تاکەیە، مافێك کە مافەکانی کۆمەڵگاو مەنزومە ڕەوشتیو مەعریفییەکانی تیٚ دەپەڕێنیٚ ، بەلاّم ئەم تاکە کە لە ڕووی بیردۆزەییەوە ئازادە ، بەکردەوەیی کەوتۆتە ژێر چنگی گۆڕاوەکانەوە و دەزگا ڕاگەیاندنە ڕۆژاواییو کۆمپانیا فرە ڕەنگ و ڕەگەزەکان و پیشەسازی چێژ وەرگرتن کۆنترۆڵیدەکەن.

هێرش کردنە سەر فیکرەی کۆمەڵگای مرۆیی و چەمکی مرۆڤایەتی هاوبەش (تێکڕای مرۆڤەکان) لە چەمکی نویٚو (تازەی) کەمینەکاندا بەدەردەکەویٚ کە لە لایەن سستمی نویٚی جیهانی و دەزگای نەتەوە یەکگرتوەکان هەندیٚ لەو کۆمەلاّنەی لە فەزایدا دەخولێنەوە و بانگەشەکەرانی بیردۆزەی مافە نوێیەکانە وە ڕەواجی پیٚ دەدریٚ و کۆمەڵە ئاینیو ڕەگەزی و نەشازە سێکسیٚ و کەم ئەندامان و بەسالاّچوو قەڵەوو منداڵان و ئافرەتان و سەرجەم ئەمانە کەمینەن لە کۆمەڵگەدا،

وەفکرەی ئەوەی کە هەموو خەڵکی کەمینە بێت ، مانای نەبوونی زۆرینەیە، واتە پێوەرێکی مرۆڤانەو جێگیر بوونی نی یە ، پاشان سەرجەم کارو بارەکان رێژەیی و یەکسانن ئاژاوەی مەعریفی رەوشتی بڵاو دەبێتەوە ، جا ئەگەر هەموو کەمینەیەك مافی (رەهای) هەبێ، ئەوا ئەمە لە زەمینەی واقع دا سەردەکێشێ بۆ ئەوەی کە فیکرەی ئەو کۆمەڵگایەی کە پشت دەبەستێ بە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی وباوەڕ بە مرۆڤایەتی هاوبەشمان ، دەبێتە شتێکی هەرگیز نەبوو چونکە ئەو مافە رەهایانەی پشت بە چێوەیەکی هاوبەش نابەستێ ، ناتوانێ پێکەوە ژیان پێك بێنێ .

(ئەمەش لە فەلەستینی داگیرکراودا رووی دا ، پاش ئەوەی زایۆنی یەکان بە کۆمەڵێك مافی جولەکانەی رەهاوە هاتن کە هیچ مرۆڤایەتی یەکی هاوبەش ناناسێ ، ئەوە بوو هەستان بەدەرکردنی فەلەستینی یەکان لە زەوی یەکانیان و خاپور کردنی نیشتمانەکەیان...)*

---

* ادیارە ئەمە لە زۆر شوێنی ئەم زەوی یەدا بەدی دەکرێ یەکێك لەو میللەتانەش گەلی کوردی خۆمانە -وەرگێڕ-

## ٣- ناوکۆی ژیاری و مەعریفی هەردوو بزافی ئازادکردنی ئافرەتان و بە سەنتەرکردنی مێینە

ئەم بیرو باوەڕانە چوار چێوەی ڕاستەقینەی بزافی فیمینزم پێك دەهێنن کەلەم دووایی‌یەدا لە ڕۆژاوا بەدەر کەوت،هەندێك وا گومانیان دەبردکە ئەم زاراوەی (فیمینزمە) تەنها جۆرێکی تری زاراوەی (ویمنزلیبراشن موفمینت)((Women's libration movement)) ە و کە بەشێوەیەکی ئاسایی وەردەگیرێت بۆ بزافی ئازاد کردنی ئافرەتان و بەرگری لە مافەکانیان ). هەر بۆیە ئەم زاراوە نوێیە لەسەرەخۆ جێگەی زاراوە کۆنەکانی گرتەوە وەك ئەوەی وەك یەك یا هاومانابن ، وە وەك ئەوەی ئەم زاراوە نوێیە جیاوازی لەگەڵ کۆنەکە تەنها لە زیاتر گشت گیری یازیاتر رادیکاڵی بوونی‌دا بێ.

بەڵام کە ورد دەبینەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەم زاراوە نوێیە بەتەواوی جیایە لەماناو مەدلولەکانی بزافی ئازاد کردنی ئافرەتان (کە یەکێکە لە بزاڤە ئازادی خوازە کۆنەکان و لە خولگەیەکی مرۆڤانەی هیومانیدا دەخولایەوەو باوەڕی هەبوو بە چەقێتی مرۆڤ لەم گەردونەدا وە بە بیری مرۆڤانەی هاوبەشمان کە سەرجەم ڕەگەزو ڕەنگەکان هەموو پیاوو ئافرەتان دەگرێتەوە ، وە بە بیری مرۆیی کۆمەڵایەتی کە مرۆڤایەتی خۆی لە ئینتما ژیاری و کۆمەڵایەتی‌یەکەی خۆی وەردەگرێ )

مرۆڤ لە ڕوانگەو دیدی بزافی ئازاد کردنی ئافرەتان دا کیانێکی ژیاری سەربەخۆیە لە جیهانی (سروشت مادده) و ناتوانێ ببێ مەگەر لە نێو کۆمەڵگادا هەر بۆیە ناکرێ یەکسانی کەین بە دیاردە (سروشتی/ ماددی) یەکان .

وە هەروەها ئەم بزاڤە لە هەوڵی بەرگری کردن دا بوو لە مافەکانی ئافرەت لە نێو سنورەکانی کۆمەڵگاو بەدەر لە چێوە بۆرجوازی ململانێ خوازی سروشتی/ ماددی داروینی‌دا کە کۆمەڵگە بەو پێ یە دەبینێ کە چەند گەردیلەیەکی ململانێ کارن .

لەگەڵ ئەوەش دا ئافرەت لە دیدی ئەم بزاڤەدا ، بونێکی کۆمەڵایەتی‌یەو دەچێتە قولایی پیشەو ڕۆڵی کۆمەڵایەتی یە وە، هەر بۆیە ئەم بزاڤە لە هەوڵی جێ بەجێ کردنی ئەندازەیەکە لە دادگەری ڕاستەقینە لە نێو کۆمەڵدا ٠نەك جی بەجێ کردنی یەکسانیەکی موستەحیل و دەرەکی) بە شێوەیەك ئافرەتیش خواستەکانی بەجێ بهێنی وەك هەر مرۆڤێك (پیاو بێت یا

---

* ناوکۆ -سیاق -وەرگێڕ-

دەرەکی) بە شێوەیەك ئافرەتیش خواستەکانی بەجێ بهێنی وەك هەر مرۆڤێك (پیاو بێت یا ئافرەت) لە سەلماندنی بوونی خۆی بۆ دەست کەوتنی مافی ڕەوای خۆی (ماددی بێت یا مەعنەوی) بە پێی ئەو کارانەی پێش کەشی دەکات ، بە شێوەیەکی ئاسایی بزاڤە ئازادی خوازەکانی ئافرەتان داوای دەست کەوتنی تەواوی مافەکانی ئافرەتانیان دەکرد ، سیاسی بێ (مافی ئافرەت لە هەڵبژاردن و بەشداری لە دەسەڵاتدا) یا کۆمەڵایەتی بێ (مافی ئافرەت لەتەڵاق و لە دایانگای مناڵان) یا ئابووری بێ (یەکسانی کرێی ئافرەت بە پیاو) .

وە لەگەڵ ئەوەی بانگەشەکەرانی ئازادکردنی ئافرەتان هەندێ جار ووتارێکی ئاڵۆز بەکاردەهێنن یا هەندێ جار بە شێوەیەك دەڕواننە ئافرەت بەو پێیەی تاکێکی سەربەخۆیێ لە کۆمەڵگا نەك بەو پێیەی دایك یان ئەندامێك بێ لە خێزان ، یا وا بۆی دەڕوانن بەو پێیەی مرۆڤێکی ئابووری یا جەستەیی بێت (واتا مرۆڤێکی سروشتی ماددی) بێ نەك مرۆڤێکی مرۆڤ ئاسا ، لەگەڵ ئەمانەشدا چوارچێوەی مەرجەعی و کۆتای ئەم بزاڤە بریتی‌یە لە دیدێکی مرۆیانەی وا کەسنور لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا دادەنێ و گریمانەی بوونی بەسەنتەر بوونی مرۆیی و پێوەرێکی مرۆیانە و مەرجەعیەت و سروشتێکی مرۆیانەی هاوبەش دەکا، هەر بۆیە بزاڤی ئازادکردنی ئافرەتان هەڵگری زۆرێك لە چەمکە مرۆییە جێگیر و تایبەتیەکانی ڕۆڵی ئافرەتن لە کۆمەڵگەدا وە گرنگترینیان بەشێوەیەکی سروشتی ڕۆڵێتی وەك دایك.

هەر بۆیە بەرنامەی بزاڤی ئازادکردنی ئافرەتان لە نێو چێوەیەك لە چەمکی مرۆیانەی هاوبەشدا دەبزوێ ، کە هەوڵی مرۆڤن بەدرێژای مێژووی مرۆڤایەتیەکەی وەکو چەمکی خێزان بەو پێیەی گرنگترین دەزگای مرۆڤانەی وایە کەمرۆڤ پێوەی ئالودەیە وەلەم میانەیەدا کرۆکی مرۆڤانەی خۆی جێ بەجێ دەکا لەو چوار چێوەیەدا کەسێتی ژیاری و ئاکاری خۆی بەدی دەهێنێ ، وەوەکو چەمکی ئافرەت بەو پێیەی ستوونی سەرەکی ئەم دەزگایەیە ، لەهەمان کاتدا چەند فکرەیەکی موستەحیل ناخاتە ڕو ، ناخرێتە ئەزموونێکی بێ کۆتایی بەردەوامی واوە کە پشت نەبەستێ بە هیچ خاڵێکی سەرەتایی هاوبەشی مرۆیی وەهیچ سنوور و بەندێکی مرۆڤانە یا مێژووی یا ئاکاری نەبێ ، ئەمە چوار چێوەی ژیاری و مەعریفی بزاڤی ئازادکردنی ئافرەتانەو ئەمە هەندێ لە خاڵە جێگیرەکانێتی ، هەر ئەمەش چوار چێوەی سەرەکی ئەم بزاڤە رزگاری خوازانە بوو لە ڕۆژاوادا تا ناوەڕاستی شەستەکان .

بەڵام ژیاری ڕۆژاوا گەشەیەکی وای بەسەر دا هات کە بووە هۆی گۆڕانکاری لە ئاراستەو بنیاتی دا ، ئەوەبوو تێکڕای بەرەو پێش چوونی ماددی کۆمەڵگا ڕوەو بەرزی چوو واتا دووبارە

داڕشتنەوەی خودی مرۆڤ خۆی لە بەر ڕۆشنایی پێوەرەکانی بەرژەوەندی ماددی و جەدوای ئابووری دا (کە ڕەگەزێکی سەرەکی مەنزوومەی مودێرنەی ڕۆژاواییە) و لەگەڵ ئەمەشدا بەشت و شمەك بوونی مرۆڤ بەرەو زیاتر چوو ئەمەش بەمانی بەسەنتەر نەمانی مرۆڤ و جێگرتنەوەیەتی بەشمەکەکان .

لەبەرەنجامی ئەمەشدا نمونە چەندەکی و تەکنۆکراتیەکان هەژموونیان کردووەو پرۆسە مۆرك دارەکان بەرز بوونەوەو پەیبوەندییە بۆرژوازیەکان قوڵ تربوونەتەوە ، ئەمەش بووە هۆی زیاتر بوونی هەژموونی بەها نزمە ماددیەکانی وەکو بەتوانایی کارکردن لە ژیانی گشتی دا و پشت گوێ خستنی ژیانی تایبەت –گرنگی دان بە ڕۆڵی ئافرەتی کرێکار (بەڕانی) لەگەڵ پشت گوێ خستنی ڕۆڵی ئافرەتی دایك –(جەووانی)* گرنگیدان بەبەرهەم داری لەسەر حسابی بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان ( وێنەی پتەوی خێزان و پێویستی بەدەست هێنانی ئارامی بۆ منالان) تێهەڵچوونی دەوڵەت هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و چێژ وەرگرەکان لە بواری ژیاری تایبەت دا –لەکارخستنی هەست کردن بە ئاسایشی وەروونی ناوخۆیی –لەکارخستنی گرنگی بیری مانا (فکرة المعنى) بەو پێیەی بیرێکی چەندێتی یا ماددی نییە.....هتد.

یەك لە زانایانی کۆمەڵناسی ڕۆژاوایی (کریستوفر لاش) تێبینیی ئەوەی کردووە کە هەر لەکۆتایی شەستەکانەوە موستەحیل بووە لەسەر خێزانی ئەمریکی بتوانێ بەیەك داهات بژی ، واتە بۆ دەستەبەرکردنی شایستەیی ماددی پێویستە لەسەر ئافرەت ببێتە ((کرێکار)) و ((توانایەکی وەبەرهێن)) و ((کەرەستەیەکی سروشتیی بەڕانیی)) وە بووە بە زەروور کە ئافرەت وازبێنێ لە پیشە ((تەقلیدییە)) مرۆیەکانی هاووێنەی دایکایەتی ، واتە بەتەواوی دەست گیرا بەسەر دوا پێگە و جێگەی مرۆڤ و دوا دەزگای هۆکار کە دەوەستا لە نێوان مرۆڤ و بوارەکانی ژیانی گشتی دا کە لەلایەن دەوڵەتەوە ئیدارە ، دەدراو وە دەزگا ئابوورییەکان بەڕێوەیان دەبردو کەرتی چێژ (قطاع اللذة) ئاڕاستەی دەکردن.

---

* (بڕانی) مەبەست لەهەر شتێکە کە بەرژەوەندییە ماددیەکانی تیادا بەدی بێ و ڕووکارە زەمینیەکانی تیادا بەرجەست بێ بە پێچەوانەی (جەووانی) یەوەیە کە گرنگی دانە بە بەهاکان و چەمکە بالا مەعنەویەکانەوە –وەرگێڕ–

ئاستی پێگەیشتنە ماددییەکان گەیشتە پلەیەکی باڵا لەگشت گیری و قوڵ بوونەوەبۆ سەرجەم لایەنەکانی ژیانی گشتی و تایبەتی‌ی تا وای لێ هات کاری مرۆڤانە Labour ئەو کارەیە کە مرۆڤ لەبەرامبەری کرێ یەکی نەختینەی حساب کراودا (دیاری کراوم) پێ‌ی هەڵ دەسێ و مل کەچە بۆ یاساکانی خستنە ڕوو داواکاری ، بەو (العرض والطلب) پێیەی لەمەوداکانی ژیانی گشتی‌دا پێ‌ی هەستێ یا لە کۆتاییدا برژێتە ناوی . ئەم پێناسەیەش بە شێوەیەکی ئاسایی دایکایەتی و پێگەیاندنی منالان و هەموو کارە ناو ماڵیەکان دوور دەخاتەوە (وبەکاریان دانانێ...) چونکە وێنەی ئەم کارانە ناتوانرێ بەووردی حیساب بکرێ و ناکرێ مێینەش لەبەرامبەریدا کرێ یەکی نەختینە وەرگرێ لەگەڵ ئەوەی زۆربەی ژیان و گرنگی پێدانی ئافرەتان لە خۆ دەگرێ ئەگەر بیەوێ بەئەمانەتەوە ئەنجامیان بدات ، ناشکرێ لەکاتی جێ بەجێکردنیدا چاودێری بکرێ کاتێك لە مەودای ژیانی تایبەت دا ئەنجام دەردرێ . (دەتوانرێ بوترێ) زۆر بەکورتی کاری ئافرەت لە ماڵ دا کارێکە ناکرێ حیسابی (نرخەکەی)) بکرێ (لەگەڵ ئەوەی ((بەهاکەی)) تا ئەو پەڕی بە نرخە ) ، لەگەڵ ئەوەشدا بە ((کار)) دانانرێ ، تەنانەت ئێستە وا بلاوە ، کاتێ ئافرەتی ماڵ سەبارەت بە جۆری کارەکەی پرسیاری لێ دەکرێ دەڵێ: ((هیچ کار ناکەم ، لە ماڵدا دەمێنمەوە)) ، بەو مانایەی پیشەی دایکایەتی ((سەرەڕای گرنگی‌یەکەی)) و کارکردن وەك دایك ((سەرەڕای ئەو ناخۆشی‌یەی لە جێ بەجێ کردنیدا دەیبینێ)) هیچ نی‌یە ، چونکە لە بەرامبەریدا کرێ وەرناگرێ و لە ناوەندی ژیانی گشتی‌دا ئەنجام نادرێ .

بەم شێوەیە مەرجەعیەتی ماددی (بە جەخت کردنەوەی چەندی و بەڕانی‌یەکەی) قوڵ بویەوە و مەرجەعیەتی مرۆڤانەی هیومانیەت (بە جەخت کردنەوە لە سەر چۆنێتی و جەووانی) لەگەڵ ڕەهەندی مرۆڤانەی کۆمەڵایەتی کە گریمانەی چەقێتی مرۆیانەو سروشتێکی مرۆڤانەی تاکانەی دەکرد و خاوەنی ئەندازەیەکی بەرز و جێگیری وابوو کە جیای بکاتەوە لە یاسا سروشتی‌یە ماددیە گۆڕاوەکان پاشە کشەیان کردوو وەبە هەستکردنی مرۆ لە دەرەوەی ناوکۆ کۆمەڵایەتی‌یە مرۆیەکەیەوە دەبێتە مرۆڤێکی سروشتی ماددی کەممی . کە هیچ ڕۆڵێکی نەبێت لە چەقێتی ئەم گەردوونەداو پایەیەکی تایبەتی تیادانەبێ ، هەروەك شتو مەکە سروشتی / ماددیەکانی تر گۆڕانکاری و ئاڵوێری بەسەردابێ . واتە مرۆڤ بە تەواوی هەڵوەشایەوەو لە مرۆڤێکی دابڕاو لە سروشتەوە دەگۆڕا بۆ مرۆڤێکی سروشتی / ماددی ، کە لەگەڵی یەك دەگرێ

و تیایدا دەتوێتەوەو پێوەرێتی خۆی لەوەوە بەدەست دێنێ ، ئەو کاتە (دال) کە (مرۆڤە) . مانای ڕاستەقینەی خۆی وون دەکاو چەند شوێنی چۆن و نرخ شوێنی بەها دەگرێتەوە .

ئێمە وای بۆ دەچین کە بزاڤی فیمینزم کە (بە بزاڤی سەنتەر بوون بەدەوری مێینەدا وەری دەگێڕین) دەربڕی ئەم گۆڕانکاریەوە لابردنی مرۆڤە لە چەقێتی ئەم گەردوونەو بالآ دەستی سروشت / مادده بەسەر مرۆڤدا . ئەم دیدو ڕوانینەش لە دوو قۆناغدا خۆی مانا دەکا :

١- قۆناغی تاك ڕەهەندی ئیمپریالی و دوالیزمەو یەم ڕەهەندی نەگۆڕ کە جیهان تیایدا دابەش دەبێت بۆ نێرینەیەکی تەواو چەق بەستوو بەدەوری نێرینەی خۆیاندا و لە هەوڵدان بۆ ململانێەتی مێینەکان و زاڵ بوون بەسەریاندا ، وە بۆ مێینەیەکی تەواو چەق بەستوو بەدەوری مێینەیەتی خۆیاندا ، و بە ڕۆڵی خۆیان لە هەوڵی ململانێ کردنی پیاوان و زاڵبوونن بەسەریاندا .

٢- زۆر بە خێرایی ئەم تاك ڕەهەندیە ئیمپریالی و دوا لیزمەو تاك ڕەهەندیيە نەگۆڕە شی دەبێتەوە تا ببێتە تاك ڕەهەندی ماددی ناجێگیر کە جیاوازی نێوان نێر و مێ نازانێ . هەربۆیە نێرینە لەگەڵ مێینەدا لە مل ملانێدا نین ، بەڵکو هەموویان لەیەك پێکهاتەی سەدیمی بێ نیشان و بەش دا دەتوێنەوە .

## ٤-تاك ڕەهەندی ئیمپریالی و دوالیزمەو تاك ڕەهەندی نەگۆڕو چەق بوون بەدەوری مێینەدا

بزاڤی بەسەنتەر بوونی مێینە لە یەکێك لە لایەکانی دا جەخت لەسەر جیاوازیە قوڵەکانی نێوان پیاو و ئافرەت دەکا ، لە ڕوانگەیەکی تاك ڕەهەندی ئیمپریالی و دوا لیزمەی من و ئەوی نەگۆڕەوە دەڕوانێ ، وەك ئەوەی مەرجەعیەتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا نابینرێت ، (یا-) وەك ئەوەی کرۆکی مرۆڤانەی هاوبەش کۆیان ناکاتەوە . هەربۆیە ڕۆڵی ئافرەت وەك دایك کارێکی بەهەند نی‌یە ، لێرەوەش دەزگای خێزان بە قورساییەکی لە توانا بەدەر دادەنرێ .

ئافرەت بەدەوری خۆیدا چەق بەستووەو ئامارژە بۆ خۆی دەکاو پێویستی بەخۆیەتی و خوازیاری ((دۆزینەوە))ی خودی خۆی و (جێبەجێکردنێتی) لەدەرەوەی هەر بازنەیەکی کۆمەڵایەتی ، لەباری ململانێیەتی گەردوونی نەبڕاوەدایە لەگەڵ پیاوی چەق بەستوو بەدەوری خۆیدا وەك ئەوە گەلی هەڵبژاردەی خوا بێ لەبەرامبەر غەوارەکاندا* ، واتە پرۆسەیەکی کرداری لێك هەڵوەشانی مێژوویی لەسەرخۆ دەستی پێ کرد بۆ دەستەواژەی ئافرەت هەروەك لە مێژووی مرۆڤایەتی و چێوەی مەرجەعیەتی مرۆڤایەتی‌دا پێناسەی کرا ، تا بە تەواوی دەستەواژەیەکی نوێ جێی بگرێتەوە کە بە ((ئافرەت)) ناو دەبرێ بەڵام لە کرۆکیدا تەواو جیاوازە لە ئافرەتی پێشوو .

هەر لەگەڵ ئەمەش دا بزاڤی بەسەنتەر بوونی ئافرەت لە بزاڤێکەوە کە گرنگی‌دەدا بە بیری مافە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانی ئافرەت دەگۆڕێ بۆ بزاڤێك کە گرنگی دەدا بە بیری پێناس (هویة) ، وە لە دیدێکی تایبەتی مافەکانی ئافرەت لە کۆمەڵگەی مرۆیی‌دا ، بۆ دید و ڕوانینێکی مەعریفی ئەنثرۆپۆلۆجی کۆمەڵایەتی فراوانی تایبەت بە کارو بارەکانی وێنەی: ڕۆڵی ئافرەت لە مێژوودا ، دەلالەتی مێینەیی ئەو ڕەمزانەی مرۆڤ بە کاری دێنێ .

لە کاتێکدا بزاڤی ڕزگاری خوازی ئافرەتان گرنگی دەدا بە کێشەی جێ بەجێ بوونی دادگەری ئافرەتان لە نێو کەمەڵگەدا ، ئەوا بزاڤی بە سەنتەر بوونی مێینە بەپێچەوانەی ئەمەوەیە ، ئەو لە چەقی ململانێوە دەڕوانێتە جیهان ، (جیهانێك) نێر و مێ هەریەکەی خۆی دەخوێنێتەوە ، مێژووی شارستانی‌یەتی مرۆڤایەتیش دەبێتە مێژووی ململانێی نێوان پیاو و

---

* غەوارە = الاغبار = الدخیل ...

ئافرەت و زاڵ بوونی نێر بە سەر مێدا و هەوڵدانی مێ بۆ دەرباز بوون لەم هەژمونە ، هەڵدێ لە مێژووە ئایدۆلۆژی‌یەکانی سەنتەر بوونی مێینە باس لەوە دەکەن هەژموون و زاڵی نێر بە سەر مێدا لە ئەنجامی جەنگێك یا کۆمەڵە جەنگێکەوە بەدی هاتووە کە لە سەردەمانێکی زۆر کۆنەوە ڕوویداوە ئەو کاتەی سەرجەم کۆمەڵگاکان دایکایەتی ، دایك سالاری ( matriarchay ) بوون ، مێینە یا دایکان زاڵ بوون بە سەریاندا ، خوایەکان مێینە بوون ، ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی سیفەتێکی مێینەی هەبوو ، واتە نەرم نیانی و پێکەوە سازی و بازنەیی (إستدارة) بوونە، کە بە مەمك و ئەندامی مێینە دەچێ .

پاشان نێرینە زاڵ بوون و کۆمەڵگەیەکیان پێك هێنا لە سەر بناغەی ململانێ و چەك (کە بەئەندامی نێرینە دەچێ)و داگیرکردن (کە بە هێرش و پەلاماری نێرینە بۆ مێینە دەچێ) .
پاشان نێرینە زاڵ بوون و کۆمەڵگەیەکیان پێکهێنا لەسەر بناغەی ململانێ و چەك (کە بەئەندامی نێرینە دەچێ) و داگیرکردن (کە بەهێرش و پەلاماری نێرینە بۆ مێینە دەچێ).

بەڵکو سەرجەم مێژوو بە دەووری یەك چەقدا خوولی دەخوارد ئەویش بریتی‌یە لە پیاو — ئەندامی نێرینە — دەسەلآت — خوای نێر — باوك — ئەمەش کۆمەڵگەی باوکایەتی ، باوك سالاری (patriarchay )یە ، بانگەشەکەرانی پۆست مۆدێرنە و بە سەنتەر کردنی مێینەیە قسە لە سەر لۆگسی (logos) (واتە ووشە و ڕەها و سەنتەر) ، و فالوس (phallus) (واتە ئەندامی نێرینە) دەکەن ، ئەوان وای بۆ دەچن جیهان بە دەوری لۆجۆس و لۆجۆسنترك ) (logo-centric)دا چەق بەستوو نی‌یە ، هەروەك هەندێ لە بانگەشە کەرانی نێرینەی پۆست مۆدرێنە بانگەشەی بۆ دەکەن ، بەڵکو بە دەووری ئەندامی نێرینەدا (فالوجوسنتریك) ) (phallogo-centric)دا چەق بەستووە و گێڕانەوەی ڕووداو و بە سەرهاتەکانی مێژووش لە دید و ڕووانگەیەکی نێرینەی ڕووتەوە باس دەکرێ بە تەواوی مێینەی تیادا دوور دەخرێتەوە ، هەر لێرەوە بانگەشە کەرانی پۆست مۆدرینە و بەسەنتەر بوونی ئافرەتان بە زەروری دەبینن (کۆتایی‌یەك) دابنرێ بۆ ئەو مێژووە و ئەو جیهانە نێرینەیە هەڵوەشێنرێتەوە .

وەك پێگەیەك لەم ڕووانگە مێژوویی‌یەوە بانگەشەکارانی بە سەنتەر کردنی ئافرەتان داوای ئەزمونی بەردەوام و درێژ خایەن دەکەن و بەرنامەیەکی درێژ خایەنی وا دەخەنە ڕوو کە بانگەشە بۆ دارشتنەوەی هەموو شتێك دەکەن: مێژوو زمان و هێماکان (الرمون) تەنانەت سروشتی مرۆڤ خۆیشی بەو شێوەیەی بە درێژایی مێژوو بە دی هاتووە و لە دەزگا

مێژووییەکاندا بەدەرکەووتووە و لە کارە هونەرییەکانیشدا ڕەنگی داوەتەوە ، چونکە ئەم بەدی هاتن و بەدەرکەوتن و ڕەنگ دانەوانە بریتین لە لادان و دەرچوون لە ڕێڕەوی ڕاستەقینەی مێژوو .

لە بواری دانانی ئەم بەرنامە ((شۆڕش گێڕییە)) بۆ جێ بەجێ کردن ، بانگەشەکارانی بە سەنتەر کردنی ئافرەتان داوای پێویستی دووبارە گێڕانەوەی مێژوون لە ڕوانگەیەکی مێینانەوە (واتە بە سەنتەر کردنی ئافرەت تیایدا) ، بەڵکو ناوی مێژووش دووبارە داڕێژرێتەوە ، مێژوو بە ئینگلیزی ( هستوری – history )یەو هەندێ لە زیرەکەکان دەڵێن مانای ((چیرۆکی ئەو history))ی دەگرێتەوە ، هەر بۆیە بڕیار درا ناوی مێژووش بگۆڕێ بۆ ئەوەی ببێتە (چیرۆکی ئەوەی مێینە her story ) ، بەو واتایەی مێژووی نێرینە بە تەواوی جیایە لە مێژووی مێینەکان (بە تەواوی وەکو ((مێژووی جولەکە))ی جیا لە ((مێژووی مرۆڤایەتی)) ) .

ئەو هێما و نیشانانەی نێرینە سەپاندوویەتی دەبێ ئەو هێما و نیشانە مێینانەیان بۆ زیاد کرێ ، کە دەربڕی ناسنامەی مێینەیەکی سەربەخۆن ، بەرهەمە هونەرییەکانی مرۆڤیش دەبێ دەربڕی مێینە و ئازارەکانی بن .

ئەدەبی نوێی ڕۆژاوایی جەختتێکی زۆری لە سەر بوارە ململانێیەکانی پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت و چەندان بابەتی تری ئەدەبی وێنەی داوێن تکانن (اغتصاب)ە .

ئامانجی سەرەکی بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە ، لە کۆتایی کار و دوا شی کردنەوەیدا ، بەرز کردنەوەی هۆشیاری ئافرەتانە بە خۆیان وەکو ئافرەت و جوان ڕۆڵ بینینیانە لەو جەنگە نەبڕاوەیەی لەگەڵ پیاواندا هەیانە و بە سیاسی کردنیانە ، نەك بە مانا بڵاوە بەکارهێنراوەکەی (واتە هەست کردنی مرۆڤ بە ڕەهەندە سیاسییەکانی دیاردەکانی دەور و بەری و بە ماف و ئەرکە سیاسییەکانی) بەڵکو بەو مانایەی هەموو شتێك دەربڕی ئەو ململانێ گەردوونییەی نێوان نێرینە و مێینەیە .

تیری ئیجلتۆن کە خاوەنی ئاراستەیەکی ڤیمینزیمییە نمونەیەك دەهێنێتەوە لە سەر شیکردنەوەی تەفکیکی و تەئکید دەکاتەوە لە سەر ئەم بیرۆکەی ململانێیە ، کە چۆن دەبێ یەکێ لەم دوو جەمسەری ململانێیە هەژمون بکا بە سەر ئەوی تردا ، نە خۆشەویستی هەیە و نە بەزەیی پێداهاتنەوە و مرۆڤایەتییەکی هاوبەش ، بەڵکو ململانێیەکی دڕندانە هەیە ، لە ململانێ چینایەتییەکەی مارکس یا ململانێی جۆر و ڕەگەزەکانی داروین یا ململانێی نێوان

رەگەزی سپی و رەگەزە ((جیاوازەکانی)) تر بە پێی دیدگا رەگەز پەرستی‌یە ئیمپریالی‌یە رۆژاوایی‌یەکە و چەند وورد کاری‌یەك نەبێ هیچی وای کەم نی‌یە .

(تیری ئیجلتون) دەڵێ:

((کۆمەڵگا نێرینەکان کە بە دەوری نێردا سەنتەریان گرتووەو وای بۆ دەچن کە پیاو بناغە و ئەسڵی جێگیرە(بنەمای یەکەم – لۆگۆس)و ئافرەتیش بە پێچەوانەوە)) بەڵام لە زەمینەی واقع دا ئافرەت ئەو ئەسڵەی ترە کە بێ دەنگی لێ کراوە . ئافرەت بە پێچەوانەی پیاوەوە ، ئەوە کە ئەگونجێ ئاماژەی پێ بکرێ بەوەی (پیاوەکەی ترە) ئەو پیاوە نی‌یە بەڵکو پیاوێکی نەنگاوی و کەم و کورتە بە پێی وێناندنی کۆمەڵگا نێرینەیی‌یەکان .

بەڵام پیاو ئەوە پیاو نەك لە خودی خۆیدا بەڵکو لە ڕێگەی کۆیلە کردن و شاراوە کردنی پێچەوانەکەی ، ئەو پێناسەی خودی پیاوەتی خۆی وەك دژێکی ئافرەت دەکا ، هەموو بوون و ناسنامەیەکی بە تەواوی پەیوەستە بە هەوڵ دانی بۆ خۆ تەئکید کردن و بونێکی سەربەخۆ لە ئافرەت ، ئەو لە بەرامبەر ئافرەتەوە خۆی پێناسە دەکا ، ئافرەت پەیوەندی‌یەکی بەهێزی بەوەوە هەیە بەو پێیەی وێنە پێچەوانەکەی ئەوە ، ئافرەت وێنەیەکە کە ئەو نی‌یە، وە ئەو (ئافرەت ) دەربڕی ئەو پەنهانی‌یەیە کە ئەو لێی ئەترسێ ،ئەو (پیاو–) دەیەوێ ئامادەیی تەواوی خۆی تەئکید کاتەوە .

(بەڵام ئافرەت بەم کارەی دەبێتە ڕەگەزێکی سەرەکی لە بە نێرینە کردنی پیاودا ، ئامادەبوونی لە غیابی ئەودایە ، هەر بۆیە لە ڕاستی‌دا پیاو پێویستی بەوی ترە) تەنانەت لەو کاتەش دا پەستە پێی وە ناچارە ناسنامەیەکی ئیجابی بە یەکێك ببخەشێ کە بە هیچی دانانێ ، لە بونیدا بە شێوەیەکی مشەخۆرانە پشت بەوە دەبەستێ و بوونی ئەم لە سەر دوور خستنەوەی ئەو ڕاوەستاوە ، ئەو (پیاو ) دووری دەخاتەوە چونکە لە هیچ کاتێکدا ئەو (ئافرەت ) نابێتە ئەوی دی .

لەوانەیە ئافرەت ئاماژەیەك بێ لە سەر شتێك کە لە خودی پیاودایە ، شتێك کە پێی خۆشە سەرکوت (کبت)و دووری خاتەوە بۆ دەرەوەی بوون و سنووری خۆی لەوانەیە ئەوەی لە دەرەوەی پیاودا بێ لە ناوەوەیدا هەبێ ، وە ئەوەی نامۆیە پێی نزیکە لێیەوە.

(لە بەر هەموو ئەمانە پیاو وا دەبینێ پێویستی‌یەکی هەرە زۆری بەوەیە پاسەوانی سنوورە ڕەهاکانی نێوان جیهانی خۆی و جیهانی ئافرەت بکا بە سەرجەم توانایەوە بە هۆی ترسی

ئەوەی تێپەڕاندنی سنوورەکان ،شتێکی خراوە ڕوو گونجاوە ، سنوورەکان بەو شێوە نین هەروەك لە سەرەتاوە دەردەکەون).

لەم لێشاوی ووشە و چەمك و هەڵ ڕشتنانەدا مرۆڤ تەسەور دەکا کە باسەکە سەبارەت بە چەمکی سنور و ئاسایشی دەوڵەتی زایۆنی بێ یان باسی پەیوەندی نێوان یەکێتی سۆڤیەتی جاران و وولاتە یەکگرتووەکان بێت لە جەنگی سارد دا ، یان باسی جەنگەکانی پیاوی سپی بێ دژ بە گەلانی ئاسیا و ئەفریقیا ، نەك باس لە پەیوەندی پیاو و ئافرەت بێ . (هاوڕێیەکی پێشڕەوانی بزاڤی بە سەنتەر کردنی ئافرەت هەواڵی پێدام کە پەیوەندی سێکسی نێوان پیاو و ئافرەت لە کرۆك دا ڕوو بە ڕوو بوونەوەکی سیاسییە (بەم شێوەیە) وەلامی منیش بۆی ئەوە بوو کە: یا هیچ سەبارەت بە پەیوەندییە سێکسییەکان نازانێت یا سەبارەت بە ڕوو بە ڕوو بوونەوەی سیاسی) .

ئەمە ئەو دیدگا ململانێ داروینییە دڕندانەیەیە کە دید و ڕوانین بزاڤی بە سەنتەر کردنی ئافرەت سەبارەت بە هەست و سۆزی هەریەکە لە ئافرەت و پیاو دەیخاتە ڕوو، لە نەمانی هەستی مرۆییانەی هاوبەش دا ناکرێ هەست و سۆزی هاوبەشی نێوان نێر و مێ بەدی بێت ، چونکە پێکهاتەی جەستە و سروشتی فسیۆلۆجی هەریەکەیان جیایە و (مرۆڤی سروشتی / ماددی) تەنها بە جەستە دەژی و کەش و بارەکەی بە جەستە سنووردارە هەر بۆ نمونە پیاو سك پڕبوونی نییە و منالی نابێت لێرەوە ناگونجێ لە کاتی سك پڕی و چرکە ساتی منال بوون دا هەست بە ئازار و خەم و دلشادییەکانی ئافرەت بکا ، هەر بۆیە تەنها خۆیەتی و لاشەی (هەر بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی وولاتە یەکگرتووەکان هەستا بە کردنەوەی چەند خولێکی ڕاهێنانی پیاوان تا فێری ئازارەکانی ئافرەت بن لە نێوان ئەو ڕاهێنانانەدا پێدانی سکێکی هەڵ ئاوساوی پلاستیکییە بە پیاو تا لە بەری کاو لێرەوە هەست بە ئێش و ئازاری ژنە سك پڕەکەی بکا وەك ئەوەی سك پڕی و لە دایك بوون بە تەواوی مەسەلەیەکی ماددی و زەمینی بێ: تەنها هەڵ گرتنی کۆڵێ قورسایی پلاستیکی !)

هەمان ڕواڵەت واتە جیا کردنەوەی تەواو لە دیدگا و هەستەکانی نێوان پیاو و ئافرەت و ئینکاری کردنی بوونی سروشتێکی مرۆییانەی هاوبەش لە هەڵوێستی بزاڤی بە سەنتەر کردنی ئافرەت لە زمانیش دا بە دەردەکەوێ ، ئەم بزاڤە وای بۆ دەچێ کە زمانی ئافرەتان بە تەواوی جیایە لە زمانی پیاوان ، زمانی ئافرەتیش زمانێکی چەماوەی گەماوییە بە وێنەی جەستەی ئافرەت (جارێکی تر جەستە و بەردەوام جەستە، لە سرەتا کۆتاییدا ). هەر بۆیە پێکگەیشتنی

نێوان نێرو مێ شتێکی گونجاو نییە ، ئەگەر بەدیش هات بە تەواوی نابێ ، لێرەدا هێرش دەکرێتە سەر ئەوەی بە (نێرینەیی زمان) ناو دەبرێ و بانگەشە دەکرێ بۆ بە (مێینە کردنی ) وە ئەو زمانانەی دارشتەی نێرینەیی لە دارشتەی مێینەیی بە باشتر دەزانێ ، پێویستە بەشێوەیەك دابڕێژرێتەوە کە دارشتەی بێ لایەن یا دارشتەی نێرینە- مێینەیی بەکار بهێنێ ، هەر بۆیە هەریەکە لە وشەی (ئەو کە بە ئینگلیزی : هی he ) یەو ( ئەو بۆ ئافرەت کە بە ئینگلیزی:شی: she) یە دەبێ بەم شێوەی ە دابڕێژرێتەوە ( he/she یا she/he) تا گومانی ئەوە نەبرێ کە پیاو لە ئافرەت باشترە ،لە هەوڵێکی جیاکردنەوەی تەواوی نیوان پیاو ئافرەت و بە مێینە کردنی زمان دا دووبارە ئەم ووشانە دەنوسرێتەوە لەوانە ووشەی((ئافرەت womwn)) بەم شێوەیە ((women)) بنوسرێتەوە بۆ ئەوەی ووشەی ئافرەتان لە ئینگلیزی دا (men) واتەپیاوان لە خۆ نەگرێ پەنا بەخوا. تێبینی ئەوە کراوە کە (پیاوە بەفرینە) (پیاو) دەستکاری ناوەکەی کرا بۆ ئەوەی لە (snow man )ـەوە ببێتە (ئافرەتە بەفرینە) کە بە ئینگلیزی: سنوومان (snow woman) یا ببێتە (مرۆڤە بەفرینە) کە بە ئینگلیزی سوبرسون: (snow person)ـە .

هەمان شت پیادە دەبێ بە سەر ئەو ووشانەی بەکاردەهێنرێن بۆ بە خودی خوایەتی (الذات الآلهیة) پێویستە دوور بگیرێ لە ئاماژەکردن بۆ خوا بەو پێیەی نێرینە(ذکر) بێ ، کەواتە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ بەو پێیەی نێر و مێینەیە لە یەك کات دا ، هەر بۆ نمونە دەوترێ (( إن الخالق هو الذي / هي التی ، وضع / وضعت ... تاد ))[1] بەڵکو هەندێ جار هەر بە مێینەیی ئاماژەی پێ دەکرێ ، وەك ئەوەی ئەو (ملكة الدنيا)و (سـيدة الكون)ە . هەروەك هەندێ لە بانگەشەکارانی بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە هەندێ ووشە بە کاردەهێنن کە بێ ڕەگەز و (بە ئینگلیزی: ان جندرد un gendered )ی پێ دەووترێ وەکو (هاوڕێ: فریند Frend ) و (کومبانیون compamion ) – هاوەڵ و (کوکریتور co-creator ) . بەشدار لە دروست کردندا ) وەك ئاماژەیەك بە خوا .

---

[1] ئەمە لە کوردیدا کەمتر دەردەکەوێ – وەرگێڕ –

هەموو ئەمانە گەڕەلاوژەن ، بەرنامە نین بۆ چاکسازی ، بەڵکو هێرشە بۆ سەر زمانی مرۆڤایەتی و سنوورەکانی و شێواندنی . ئایا ئێمە بیر دەکەینەوە لە ووشەی (مقاومة - بەرگری) بەو پێیە مێینە (انثی)یە و لە وشەی (صمود - خۆڕاگری) بەو پێیەی نێر (ذکر)ە؟

وە ئایا بیر لە ( أمانة- سپاردە) و(خیانە-ناپاکی) دەکەینەوە بەو پێیەی بۆ مێینەن ، یا(ملاك-فریشتە) و (شیطان) بەو پێیەی نێرینەن ؟ وە کاتێك دەڵێین (ابواب — دەرگاکان) ئایا لە بیری ئەندامی نێرینەداین ، تا لەکاتی ووتنی (بوابات)دا بیر لە ئەندامی مێینە بکرێتەوە یا خود ئەمە ویژدانی حلولی یە سروشتی‌یە ماددیەکانە کە لاشە وەك ڕەگەزێکی سەرەکی هەست کردن بە شتەکان دادەنێن ؟ پاشان تەسك کردنەوەی بازنەکە بۆ ئەوەی ئەندامی نێرینە و مێینە ببێتە ئەو تاکە وێنەیەی لێیەوە هەست بە جیهان بکرێ؟ ئایا گونجاوە بەکارهێنانی ووشەی مرۆڤ (إنسان) ، (کە دەربڕینێکە بۆ نێر و مێ) ببێتە چارەسەری کێشەکە؟ وەلامیش بە شێوەیەکی سروشتی ، نەرێیە ، چونکە ئەوەی گرنگ بێ لە ڕوانگەی بە سەنتەر کردنی مێینەوە بریتی‌یە لە خستنە ڕووی بەرنامەی چاکسازی موستەحیلی وا کە ناکرێ جێ بەجێ کرێ ، وە ئەزمونکردنی بەردەوامی بێ ڕابردوو ، بێ (یاداشت)و بێ تێکەیشتنە ، ئەمەش بۆ ئەوەی سنووری زمان و مەرجەعیەتی مرۆییانەی هاوبەش و سەرجەم مەنزومەی بەهاکان بپوکێنێتەوە .

وە دیدی یەك ڕەهەندی و دوالیزمەی ململانێی جێگیر و نەگۆڕ لە ئامارە یەك لە دوای یەکەکانی ئەدەبیاتی بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە لەوەدا ڕوون و ئاشکرا دەبێ کە سەیری ئافرەت دەکا بەو پێیەی کەمینە (اقلیة)یە ، ووشەی کەمینەش مانای کەمینەیەکی ژمارەیی چەوساوە نی‌یە ، بەڵکو لە واقع دا مانای ئەوەیە کە زۆرینە لە هیچ جۆرێکی (مرۆڤایەتی هاوبەش)دا بونی نی‌یە و هیچ پێوەرێکیش نی‌یە کە بڕیاری بە سەردا بدا ، هەمووان یەکسانن و ناکرێ بڕیار بەسەر کەس دا بدرێ .

ئەم دید و ڕوانینەش کاتێ دەگا بە لوتکە کە بڕیاری ئەوەی دا کە مێینە پشت هەڵ کا لەوی تر / کە بە تەواوی پیاوە ، ئەو خۆی مەرجەعیەتی خۆیەتی و جێگەی چارەسەرەکانە و تەنهاش ئامارە بە خودی خۆی دەکا ، ئەو (سوپرهومان super woman ) ، هەر بۆیە جیابونەوەی

تەواوی خۆی لە پیاو ڕادەگەیەنێ ، ئا لەم کاتەدا (سوحاق*) دەبێتە دوا دەربڕینی تاك ڕەهەندی ، چەسپاو و نەگۆڕ .

ئەمەش کارێکی سروشتی و لواوە بۆ ئەو ئافرەتەی کە پەسەندی ناکا جەخت لە سەر (مرۆڤایەتی هاوبەشی بکرێ) کە ناکرێ بەدی بێ مەگەر لە چوار چێوەیەکی کۆمەڵایەتی و ناوکۆیەکی مێژوویی دانە بێ ، لە جێی ئەمە جەخت لە سەر (ئافرەتێتی) واتە خودی مێینەیی دابڕاو دەکا کە لە هیچ ناوکۆیەکی مێژوویی یا لە نێو هیچ چوار چێوەیەکی کۆمەڵایەتیدا نابینرێ .

وە هەروەکو یەکێك لە بانگەشەکارانی بە سەنتەر کردنی ئافرەت کە ڕەفتار نەشازە ، لە ڕووی سێکسییەوە ووتویەتی: (ئەگەر ڤیمینزم بیردۆزە بێت ، ئەوا سوحاق پیادەکردنەکەیەتی) . (If fiminism is the theory, lesbianism is the practice)

ئەوەش ئەبێتە شتێکی سروشتی کە ئافرەت بۆ منداڵ بوون پەنا وەبەر پیاو نەبا ، بەڵکو ئەکرێ پەنا بۆ کارگە و ڕێ و شوێنە زانستی ((سروشتییە)) جیاوازەکان ببات (کە پاکژە لە مێژوو کۆمەڵگە و بەهاکان) کە پیاو وەك مرۆڤاییەتییەکی هاوبەش دوور دەخاتەوە .

بەم شێوەیە دووفاقەیی بە تەواوی پاکتاو دەکرێ و ململانێکە یەکلا دەکرێ بۆ ئەوەی بگەین بە حاڵەتێك لە تاك ڕەهەندی مێینەیی نەگۆڕ و چەق بەستنێکی نامرۆڤانە بە دەوری خودی مێینەدا ، وە بۆ کۆتایی مێژوویەك کە ئافرەت تیایدا سەنتەرە .

* پێگەیشتنی سێکسییانەی ئافرەتە لەگەڵ ئافرەت—و—

## ٥-تاك ڕەهەندی ناجێگیر و توانەوەی مێ

بیری بە سەنتەر کردنی مێینە سەر بە جۆرێکی سەرەکی‌یە لە فیکری ماددی ، هەروەك لە پێش دا ئاماژەمان پێ‌ی کرد (گواستنەوە لە بە سەنتەر کردنی خودی مرۆڤانە بۆ بە سەنتەر کردنی سروشت/مادده ، وە لە جیهانێك چەقەکەی لە ناوەوەی خۆیدا بێ بۆ جیهانێکی بێ چەق و سەنتەر) .

هەر بۆیە دەبینین هەڵوەشاندنەوەی دەستەواژەی ئافرەت (مرۆڤ) دوو شێوازی دژ بە یەك وەردەگرێ ، یەکەمیان ئەوە بوو لە بەشی پێشووی ئەم توێژینەوەیەدا لێ‌ی دواین ، واتە گۆڕینی ئافرەت لە بوویەکی چەق بەستوو بە دەوری خۆدا و ئاماژە بە خۆی دەکا لەمەشەوە سەردەکێشێ بۆ دەرکەوتنێکی پەرگیرانە بە دەوری خودی مێینەدا و دوژمنایەتی‌یەکی دڕندانە بۆ نێرینە و ململانێ‌یەکی دارووینیانەی بەردەوامی نێوانیان (تاك ڕەهەندی‌یەکی ئیمپریالی و دوالیزمە و تاك ڕەهەندی جێگیر و نەگۆڕ -الصلب- ) .

بەڵام شێوازی دووەم ئەوەیە کە بە ((تاك ڕەهەندی ناجێگیر)) ناوم بردووە . تاك ڕەهەندی ناجێگیریش لە تاك ڕەهەندی جێگیر و نەگۆڕدا شاراوەیە ، پاش ئەوەی ئافرەت لە مرۆڤێکی مرۆڤانەوە ئەگۆڕێ بۆ بوویەکی سروشتی/ ماددی دەگەڕێتەوە بۆ چەند ڕەگەزێکی ماددی و لەو چوار چێوەیەدا ڕاڤە ئەکرێ ، بە شێوەیەك ئافرەت ئاماژە بە خودی خۆی ناکا بەڵکو بە سروشت/ماددەی دەکا ، ئا لێرەدا بە پیاو یا مرۆڤی سروشتی یەکسان دەکرێ لە هەموو ڕوویەکەوە بە شێوەیەك کە هیچ جیاوازی‌یەکی لە گەڵی‌دا نەبێ ، ڕۆڵی ئەم هیچی جیاوازی نی‌یە ، لە ڕۆڵی ئەو ، هەریەکەیان مرۆڤێکی سروشتی ماددین ، ئەوەشی کۆی کردوونەتەوە مرۆڤایەتی هاوبەشیان نی‌یە بەڵکو ماددی بونی هەردووکیانە ، لێرەوە دەخرێنە ئاستێکی سروشتی/ماددی گشتی ، کە گوێ نەدا بە نێرینەیی نێر و مێینەیی مێ یا یەکسان کردنی نێوانیان ، یاسای سروشتی/ماددی گشتی‌یە و گوێ بە تایبەتمەندێتی یا دوالیزمەیی (ثنائية) نادا .

هەروەك جیهان فرە چەقە و گوێ بە هیچ جیاوازی‌یەکی دیار یا ناوەخن نادا ، چونکە جیهانێکی ناجێگیری بێ چەقە ، ناکرێ بڕیار بە سەر هیچ شتێکدا بدا .

سەرجەم ئەمانە سەر ئەکێشێ بۆ بە دەرکەوتنی یەك ڕەگەزێ یا ڕەگەزی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە (کە بە ئینگلیزی: یونی سکس uni sex)ی پێ دەڵێن ، واتە گێڕانەوەی واقع بۆ یەك ڕەگەز یا یەك بنەمای وا کە هەر شێوازێك لە شێوازەکانی نەگونجان یا هەر جۆرایەتی‌یەك ڕەت دەکاتەوە ، بەڵکو ئینکاری بوونی دوالیزمەی نێر/مێ دەکا ، نێر وەکو مێ‌یە و مێ وەکو نێرە و هەریەکەشیان تەنها مرۆڤێکی (سروشتی/ماددی)یە .

بەم شێوەیە (سوبرهومان super woman ) ئەگۆڕ ێ ، دوژمنی پیاو ، بۆ (سبومان subw man) کە هیچ ناسنامەیەکی مێینەی سەربەخۆی نی‌یە ، بگرە لە ئافرەتیش کەمترە ، ئافرەتێکی کەم و کورت ، ئەو پەڕی توانای دەخاتە گەڕ تا (کامڵ) بێ ، واتە بە تەواوی پڕاوپڕی پیاو بێ .

بەڵام لە هەردوو بارەکەدا (سوبرمان یا سبومان) ئافرەت ئەو دایك ، ژن ، خوشك ، وە خۆشەویستە نی‌یە کە ناسیومانە و ڕۆڵێکی سەربەخۆی هەیە لە نێو چوار چێوەی مرۆییانەی گشتی وادا کە نێر و مێ و بچوك و گەورە لە خۆ دەگرێ ، بەڵکو شتێکی بە تەواوی نوێ‌یە ، لەگەڵ ئەوەش دا زاراوەی (ئافرەت–إمرأة)ی بە سەردا دەچەسپێ .

بە نەمانی ژن وەك دایك و ئافرەت ، خێزانیش دائەڕخێ و کرۆکی مرۆییانەی هاوبەشیش بەرەو دواوە ئەچێ و هەموو مرۆڤەکانیش ئەبنەوە تاك تاکی سروشتی و هەر یەکەی بەرژەوەندی تایبەتی و بەسەرهاتی بچوکی تایبەتی خۆی هەیە ، هەر مرۆیەك وێنەی گەردیلەیەکەو لەگەڵ گەردیلەکانی تردا پێك دا دەدەن و لە ململانێ‌دان ، وە هەموویان تەنها ڕوو بە ڕووی دەوڵەت و کەرتەکانی چێژوو ڕاگەیاندنەکان دەبنەوە و دەکەونە چنگی گۆڕانەکانەوە و یەکسان دەبن بە گیانداران و شتەکان و یەك ڕەهەندی ناجێگیر باڵ دەکێشێ (بە سەر ژیاندا — و–) کە جیاوازی نێوان پیاو و ئافرەت یا نێوان مرۆڤ و شتەکان نازانێ .

لەم قۆناغی تاك ڕەهەندی ناجێگیرەدا (الواحدیة السائلة) ئاماژە دەکرێ بە خوا نەك بەو پێیەی (هو) — (ئەو) بۆ نێر یا (هي) بۆ مێ بێ ، بەڵکو بێ لایەنی دەگاتە لوتکە و ناجێگیری دەگاتە ئەو پەڕی ، ئاماژەی پێ دەکرێ ، هەروەك لە یەکێك لە وەرگێڕانەکانی ئەم دوایی‌یەی ئینجیل دا هاتووە ووشەی خوا بەو پێیەی نێر و مێ و شتە( he, she, it )وەرگێڕاوە . قورسیشە لە سەر مرۆڤ بڕیاری ئەوە بدا کە ئەمە کۆتایی ناجێگیری‌یە ، یاخود زیاد لەوەش

هەیە؟ ئەزموونی کراوە لە زمان و مێژوو پەیوەندی‌یەکانی نێوان مرۆڤ مەسەلەیەکی بێ سەر و
بەرەیە و هیچ کۆتایی‌یەکی نی‌یە .

## ٦-بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە و سستمی نوێی جیهانی

لە ڕاستی‌دا بانگەشەکارانی ئازاد کردنی ئافرەتان بە تەواوی ئەو ڕاستی‌یە بەڵگە نەویستە مرۆیی‌یە سادەیە هەست پێ دەکەن ، کە چەندان جیاوازی (بایەلۆجی و نەفسی و کۆمەڵایەتی) لە نێوان پیاو و ئافرەت دا هەیە ، کە ئەمەش چەند جیاوازی‌یەکن دەگۆڕێن — لە ڕوانگەی ڕەفتاری هەریەکەیانەوە . بە پێی پلەکانی قوڵی و سادەیی . لە جیاوازی دابەش کردنی ڕۆڵی نێوانیان و دابەش کردنی کاردا خۆی دەردەبڕێ ، بەڵام لە جێی ئەوەی بانگەشەکارانی ئازاد کردنی ئافرەتان هەوڵی سڕینەوەی ئەم جیاوازی‌یانە بدەن بە شێوەیەکی تەواو زاڵ بن بە سەریدا ، ئەوا ئەو پەڕی هەوڵیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی ئەم جیاوازی‌یانە نەبنە هۆی گۆڕانی بۆ ستەم یا جیاکاری کۆمەڵایەتی یا مرۆیی و سەربکێشێ بۆ فراوانترکردنی ئەو بۆشاییەی لە نێوان نێر و مێ‌دا هەیە بەڵام بانگەشەکارانی بزاڤی بەسەنتەرکردنی مێینە زۆر بە توندی لایەنگیری قوڵترکردنەوەی ئەو خاڵە جیاوازیانەی نێوان پیاو و ئافرەت دەکەن. بەو پێیەی جیاوازی‌یەکی وەهایە کە ناکرێ ببڕدرێ و لە لایەکی ترەوە ئەوەش پەسەند ناکەن کە هیچ جیاوازی‌یەك لە نێوانیان دا هەبێ هەر بۆیە فیکرەی ئەوان فیکرەی دابەش نەکردنی ڕۆڵ و بەش بەش نەکردنی کارە و جەخت لە سەر موستەحیلی پێکگەیشتنی نێوان پیاو و ئافرەت دەکەن و هیچ گرنگی‌یەك نادەن بە بیری دادگەری و هەوڵ دەدەن یا جیاوازی نێوان پیاوان و ئافرەتان فراوان کەن یا هەر یەکەیان بەوی تریان یەکسان کەن و داوا دەکەن نێرینە لە یەك کات دا باوك و دایك بێت مێینەش بە ڕۆڵی خۆی و ببێتە دایك و باوك .

لەوانەیە ئەندازەی بۆماوەیی زۆرێك لەو ((گرفتانە)) چارەسەرکاو دەرگای ئەزمود کاری بێ کۆتا بخاتە سەر پشت ، بە شێوەیەك پیاو بگونجێ بۆی — بە منداڵەوە (سك پڕبێ) (نەك سکێکی پلاستیکی) ، ئەویش بتوانێ ئازار و ئەشکەنجەکانی سك پڕی تێ پەڕێنێ لە ڕێی کردەوەکانی لە بەرگرتنەوەی ئاسانەوە .

هەروەها ڕێك کردنەوە (تەعدیل) کردنی یاساکان لە ڕۆژئاوادا سەرجەم گرفتە شەکلی‌یەکان لە ئەستۆ دەگرێ و سنورێك لەسەر کردەی ئەزمونکاری دادەنێ ، ئەوەتانێ مێینەیەك بخوازێ یاخود پیاوێك بخوازێ بەو پێیەی بە (التفضيل الجنسي-ڕەگەز پەسەندیSexual preference) ناودەبرێ . بەڵکو کارەکە سەردەکێشێ بۆ لە خۆ گرتنی خودی هەستە

بەرزەکانیش (الاحساس الجوانية) ، ئافرەتی ڕاستەقینە پێویستە هەست و سۆزەکانی لەپیاو جیا نەبێ ، وە پیاوی ڕاستەقینەش دەبێ هەست و سۆزەکانی لە هەست و سۆزی مێینە جیا نەبێ.

هۆلیۆدیش (گەورەترین ئامرازێکە کە ڕەگەزی مرۆناسیۆیتی بۆ بلاوکردنەوەی) فیکرو بیر و بۆچوونەکان هەلْ دەسێ بە ڕۆلێکی چالاك لەم بوارەدا ، ئەوەتانێ چەندان فلیمی وەها نمایش دەکا کە ئافرەتان هەلدەسن بە ئالودەکردنی پیاوان و پیاوانێك هەلْ دەستن بە سورکردنی ئارایش کردنی دەم و چاویان (هیچ بەر هەلْستیەك نی‌یە لێرەدا (نون النسوه) بەکاربهێنرێ واتە بوترێ (وجوهن) لە جیاتی (وجوههم) تاوەکو بەتەواوەتی سنوری زمان بشکێنێ ، ئامانجیش لەسەرجەم ئەمانە فراوان کردنی ئاسۆو شکاندنی قالْبە هۆشەکی یە بەستەلەکیەکان نی‌یە کە هەر ڕەگەزێك لەڕوانگەیەوە لەگەلْ ئەوی تردا هەلْس و کەوت بکاو تیایدا بەندی بکا، بەلْکو لێدانی بیری پێوەرێتی و مرۆییانەی هاوبەشە لە ناوەڕۆکدا.

تاوەکو هەموو یەکسانبن . لەوانەش زانستی نوێ ، بەو پێشکەوتنە سەر سورهێنەرانەی بەدەستی هێناوە ، لەم بوارەدا یارمەتی دەربێ بە شێوەیەك پیاو بتوانێت کە پسولێکی بەسەنتەر کردنی ئافرەت بخوا و هەمان هەستی مێینەی بۆ دروست بێ و لەناوەوەش بەتەواوی پێی یەکسان بێ ، ئافرەتیش لەولاوە کەپسولێکی بەسەنتەر کردنی پیاو بخواو هەمان هەستی پیاوی بۆ دروست بێ و لەناوەوەش بەو پێیە بگۆڕێ.

بزاڤی ئازادکردنی ئافرەتان لە کۆتایی و دوا شیکاری دا مرۆڤایەتی‌یەکی هاوبەشی نێوان هەموو مرۆڤێ ، بەپیاو و ئافرەتەو بەڕەوا دەبینێ ، و ئەم زەمینە بەر فراوانە هاوبەشەی نێوانمان دەبێتە ئەو بناغەیەی کەلەسەری پەیڤین دەکەین و ئەو چوار چێوەیەی لەناویدا بۆ جێ بەجێ کردنی یەکسانی‌ی توێژینەوەی تیدا ئەنجام دەدەین.

هەر بۆیە دەکرێ پیاو بچێتە پالْ بزاڤی ڕزگاریخوازی ئافرەتانەوە و پەیڤین بکا سەبارەت بە ئەو داواکارییانەی دەخرێتە ڕوو بۆ دەستەبەر کردن و جێ بەجێ کردنی دادگەری بۆ ئافرەتان . وە دەکرێ کۆمەلگەی مرۆڤایەتی ، بە نێر و مێیەوە ، بنیاتی بەرنامەیەك بنێ بۆ چاکسازی بەو ئاراستەیەداو وە دەکرێ هەریەکە لە پیاوان و ئافرەتان پشتگیری بکەن و پشتیوانی بن .

بەلاْم بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە ئەوا ئینکاری مرۆڤایەتی‌یانەی هاوبەش دەکا ، هەر بۆیە ناکرێ پیاوان بچنە پالْی ، پیاو بەو پێیەی پیاوە ، ناتوانێ هەست بە شعورەکانی ئافرەت بکا ، هەروەها پیاو گوناهبارە و تاوانی مێژووی نێرینەیی و باوك سالاری لە ئەستۆ دەگرێ، لەگەلْ

ئەوەی خۆی دروستی نەکردووە . هەروەك بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە جیاوازی ڕەت دەکاتەوە ، لێرەوەش بوارێك نابێ بۆ جۆراو جۆرێتی و بونی مرۆڤایەتی‌یەك بەو پێیەی ناسیومانە .

لە بەر هەموو ئەمانە لە بەرنامەیەکی چاکسازی لە لایەن بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینەوە بەدی ناکرێ و هەوڵێکی جیددیش بەدی ناکرێ بۆ جێبەجێ کردنی یەکسانی نێوان پیاو و ئافرەت یا گۆڕینی یاساکان یا ناوکۆێ کۆمەڵایەتی بۆ پاراستنی مرۆییانەی ئافرەت بەو پێیەی دایك و ژن و کچ و ئەندامێکە لە خێزانێك یا کۆمەڵگەدا .

ئەگەر بەرنامەیەکی واش هەبێ بۆ چاکسازی دەبینین لە چوارچێوەیەکی هەڵوەشاوەی وادا دەبینرێ کە ئامانجی چالاك و بە تواناتر کردنی ئافرەتە بۆ کردەی‌ململانێی لەگەڵ پیاودا یا یەکسان کردنی بە پیاو ، واتە لە سەرجەم حاڵەتەکان دا جۆرێك لە ئینکاری کردنی مرۆڤایەتی‌یانەی هاوبەش دەبینرێ . هەر بۆیە دەبینرێ بەرنامەی چاکسازی (ئەوان) بریتی‌یە لە بەرنامەیەك کە ئامانجی گۆڕینی سروشتی مرۆیی و ڕێڕەوی مێژوو و هێما و زمانەکانە .

## ٧- بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە و زایۆنیەت

لەو کارو بارانەی شایستەی تێڕوانین و بیرکردنەوەیە ئەوەیە کە چەندان خاڵی لێك چوو و ڕوون لە نێوان بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە و بزاڤێکی ئیمپریالی تردا هەیە کە ئەویش بزاڤی زایۆنی‌یەتە ، کە ئینکاری مرۆییانەی هاوبەش دەکات و زۆر بە بوێرانەوە مرۆڤ دابەش دەکا بۆ جولەکە و ئەوانەی جولەکە نین وە باوەڕیان وایە هەموو ئەوانەی کە جوولەکە نین تاوانی مێژووی تەنگە پێ هەڵچنینی بەردەوامی هەموو جوولەکەکانیان لە ئەستۆدایە .

گۆشەگیرکردنی تەواوی ئەوانەی جوولەکە نین بەو ڕادەیەیە کە هیچ کەسێك ناتوانێ هەمان هەستی ئەوی تری هەبێ ، هەموو مرۆڤێك دوورگەیەکی داخراوە ، پێویستی بە خۆیەتی و خۆیشی مەرجەعیەتی خودی خۆیەتی .

لێرەوە جولەکە هەر خۆیان ، بە تەنها خۆیان بە گۆشەگیری و پاك و بێ گەردی و تاکانە و ئەشکەنجە و ئازارەکانی خۆیانەوە ڕوو بە ڕووی جیهان دەبنەوە و کەسیش لەمەدا بەشداریان ناکەن . جولەکە گەلێکی هەڵبژاردەن ، مۆرکی تایبەتی خۆیان هەیە و چەندین مافی ڕەهایان هەیە و خاوەنی پەیامی نەمر و ئازاری تایبەتن ، جولەکە جێی چارەسەر و نهێنی‌یەکانە ، مەرجەعیەتی خودی خۆیەتی و لە خۆیەوە پێوەرێتی وەردەگرێ .

جولەکە گەلێکە باری هێمن و هێدی نابێ تا نەگەڕێتەوە بۆ زەوی پێشینانی (لە فەلەستین دا) ئا لەوێدا ئەتوانێ بە مافە ڕەهاکانی شاد بێ ، هەر بۆیە بزاڤی زایۆنی هیچ کۆششی ناکاڵە هەوڵدان بۆ بەرگری کردن لە مافە مەدەنی و سیاسی و ئایینی‌یەکانی ئەندامانی کۆمەڵگە جولەکەکان لە کۆمەڵگەکانیان دا .

وێنەی ئەم کۆششانە (کە لە باوەڕ بە مرۆییانەی هاوبەشەوە هەڵ دەقوڵێ و دەکرێ هەموو بەرگری کارێکی داکۆکی کەر لە مانەکانی مرۆڤ و هاوسۆزێکی لانەوازان پشکی تێیدا هەبێ) لە زەمینەی واقیع دا ، بێ ئومێد کردنی پرۆژەی زایۆنزمە کە دەیەوێ کۆتایی‌یەك بۆ مێژووی جولەکە لە هەندەران دابنێ و جولەکەکان کۆچ پێ بکا بۆ فەلەستین بۆ ئەوەی هەستن بە بەرپاکردنی ئەزمونێکی تەواو نوێ کە لە دەرەوەی چوارچێوەی مێژووی جولەکایەتی‌دا بێ . کەئەویش ئەزمونی دەوڵەتی نەتەوەیی خاوەن سەروەری‌یە .

لەم چوار چێوەیەدا بزاڤی زایۆنزم چڕی هەوڵەکانی ئاراستە دەکا تاوەکو جیاوازی نێوان جولەکە و ئەوانەی جولەکە نین قوڵتر بێ بۆ ئەوەی ئەدای جولەکە لەم کردەی ململانێ‌یەدا بە

چاکی ئەنجام بدریٚ و لە کۆمەڵگەی ناجولەکەدا داڕنریٚ و (بگەڕێتەوە) بۆ فەلەستین پاش دابڕانیان لە ماوەی دوو هەزار ساڵ دا .

لەم چوار چێوەیەدا دوژمنانی سامیەت (واتە دوژمنانی جولەکە) ((ڕاستگۆترین هاوەڵمانن)) (بە پێی ووتەی دامەزرێنەری بزاڤی زایۆنزم ، تیۆدۆر هرتزل) .

با لێرەدا سەرنجێ لە هەندێ دووالیزمەی چەسپاو (الثنائيات الصلبة) بدەین: جولەکە دژ بە ناجولەکەیە — گەلێکی ئەشکەنجە دراو لە هەر جێگایەك لە بەرامبەر گەلێکی هەڵبژاردە — گەلێك هیچ مافێکی نییە لە بەرامبەر گەلێك دا خاوەن مافی ڕەهایە .

وە سەرەنجی ئەوەش بدەین ئەم دوالیزمە چەسپاوە دەگۆڕێت بۆ تاك ڕەهەندییەکی زایۆنزمی چەسپاو لە دەوڵەتی زایۆنزمی سەربەخۆدا ، دەوڵەتی پوختی جولەکە. کاتێك هاوڵاتییە جولەکە نشینەکان تەنها خۆیان خاوەنی مافە ڕەهاکانن و عەرەبەکانیش خۆیان لە کۆمەڵگە پەنا هەندەکاندا دەبیننەوە کە بە ناوی بەرگری لە خودی جولەکایەتی پوختەوە بۆمبییان بە سەردا دەبارێ !

بەڵام هەروەك باوی هەموو بزاڤە ماددییەکان یەك ڕەهەندی ئیمپریالی و دوالیزمە و یەك ڕەهەندی چەسپاو دەگۆڕێت بۆ تاك ڕەهەندی ناجێگیر (الواحدية السائلة) ئەو زایۆنزمەی کە جەخت دەکاتەوە لە سەر مافە ڕەهاکانی و تاکانەیی تەواوی جولەکە و هاوکاری لەگەڵ ناجولەکەکاندا پەسەند ناکا ، وا دەبینێ بوونی جولەکە لە هەندەران و دەرەوەدا بارێکی ((ناسروشتییە)) واتە تاکانەیی دەگۆڕێت بۆ ناوازە و (شاذ) .

هەر بۆیە زایۆنزم ڕای وایە هەر دەبێ جولەکە (ئاسایی) ببێ ، واتە بگۆڕێن بۆ چەند بونەوەرێکی سروشتی ، لە دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئاساییدا بژیەن ، هیچ جیاوازییەکیان لە گەلانی تر نەبێت .

کار گەیشتووەتە ئەوەی بزاڤی زایۆنزم ئەوەی کە بانگەشەی مافە ڕەهاکانی جولەکە و سەروەری ڕەهای دەوڵەت و مۆرکەکانی جولەکایەتی کۆمەڵگەیان دەکرد هەستان بە بنیاتنانی دەوڵەتێکی خاوەن ئاراستەی ئەمریکی ڕوون لە جیاتی سیاسەت و ڕۆشنبیریدا و بە شێوەیەکی نیمچە تەواویش پشت بە هاوکاری ئەمریکییە ناجولەکەکان دەبەستن!

ئەمە هەمان ئەو شەقڵانەن کە لە بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینەدا دەیبینین ، لە لایەکەوە جەخت کردنەوە هەیە لە سەر تاکانەیی جولەکە و دوژمنایەتی ناجولەکەکان بۆیان کە ئەمەش زۆر جیاوازی نییە بە ئاراستەی بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە سەبارەت بە ڕاگەیاندنی جەنگ

دژ بە پیاوان ، لە لایەکی ترەوە هەوڵی چالاکانەی ئاوێزان بوونی جولەکە بە جیهانی ناجولەکەکان و تواندنەوە تیایاندا ، زۆر جیا نیيە لە هەوڵدانی مێینە بۆ تواندنەوەی لە پیاودا و بە دەرکەوتنی uni -sex .

جیهانی ڕۆژاواش کە پشتگیری دەوڵەتی زایۆنی دەکا ( لە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی جیهانی عەرەبی وئیسلامیدایە لە ڕووی سیاسی و ژیاریيەوە) بە هەمان هێز پشتگیری بزاڤەکانی بە سەنتەرکردنی مێینە دەکا لە وڵاتەکانماندا (لەوانەیە چالاکی سەفارەتی هۆڵەندی لە قاهیرە لەم ڕووەوە نمونەیەکی ڕوون بێ لە سەر ئەمە و شایستەی توێژینەوەی زیاترە) .

جیهانی ڕۆژاواش کە لە کردەی ڕوو بە ڕوو بونەوەی سەربازی ڕاستەوخۆیدا لەگەڵ جیهانی سێ ، شکستی هێناو دەریش کەوت ئەم ڕوو بە ڕوو بونەوەیە زۆری تێ دەچێ و دوور و درێژە و لە توانایدا نیيە ، هەر بۆیە هەڵوەشاندنەوە (تفكيك) تاکە بە دیلی عەمەلیيە .

هەروەها جیهانی ڕۆژاواش هەستی بەوە کرد کە سەرکەوتوو بوونی جیهانی سێ لە بەرگری کردن دا دەگەڕێتەوە بۆ جۆش داری و پێکدا چوونیيان ، کە ئەمەش بە ڕۆڵی خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ بوونی بنیاتێکی خێزانی بەهێز ، کە تاوەکو ئێستەش بە توانایە لە سەر گەیاندنی مەنزومە بەهاییيەکان و تایبەتمەندیيە نەتەوەییيەکان بۆ نەوەکانی کۆمەڵگا ، لە دوای ئەوەش دەتوانن یادەوەری مێژوویی و هۆشیاریيان بە ڕۆشنبیری و ناسنامە و بەهای خۆیان بپارێزن .

بێگومان ئەمەش مانای بە ڕوودا وەستانەوەی کردەی بە جیهانی بوونە ، کە واتای ڕێ نیشاندانی (لە چوار چێوە ماددیيە ڕۆژاواییيەکەدا)ی هەموو کۆمەڵگاکانە بە شێوەیەك جیهانی لە سەرەنجام و دوا شیکردنەوەدا ببێتە بازاڕێکی سازی مل کەچ بۆ یاساکانی خستنەڕوو و خواستی ماددی وا کە خوودی مرۆڤ و شمەکەکان لە یەك بواری سوڕاودا . بە بێ بەربەست یا سنوور یا چەندان مەنزومەی بەهایی وەها کە ڕێگر بێ لەم جووڵە و بزاڤە .

جا ئەگەر خێزان خشتەی بناغەیی بێ لە کۆمەڵگەدا ، لە ڕاستیدا دایك ئەو خشتە بناغەییيەی خێزانە ، لێرەوە سستمی نوێی جیهانی جەخت لە سەر دۆزەکانی مێینە دەکاتەوە . گوتاری بە سەنتەر کردنی مێینەش گوتارێکی هەڵوەشێنەرە و حەتمییەتی ململانێی نێوان نێر ومێ وزەرورەتی دانانی کۆتاییيەك بۆ مێژووی نێرینەیی باوك سالاری و بەرایی ئەزموونێکی بێ یادەوەری مێژوویی ڕادەگەیەنن ، ئەمەش گوتارێکە ئامانجی پەرەپێدانی ڕاڕایی و تەنگی و بێزاری و نائارامییە لە دەروونی ئافرەت دا لە ڕێگەی دووبارە پێناسە

کردنی‌یەوە بە شێوەیەك ناكرێ ناسنامەی خۆی بە دەست بهێنێ مەگەر لە دەرەوەی چوار چێوەی خێزان دا .

جا کاتێ ئافرەت لە خێزان پاشە کشەی کرد ئەوا خێزان دادەخورێ و بێ نرخ دەبێ ، لەگەڵ ئەمەش دا گرنگترین قەڵای بەرگری دژ بە هاتنە ناوەوەی داگیرکاری و هەژمونی ڕۆژاوایی و گرنگترین دەزگایەك کە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە یادەوەری‌یە مێژوویی و ناسنامە نەتەوەیی و مەنزومە بەهایی‌یەکانی کە مایەی پاراستنینی لە دەست دەدا .

بەمەش سستەمی نوێی جیهانی لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوەوە سەرکەووتوو دەبن لە بەدی هێنانی ئەو ئامانجانەی کە سستەمی داگیرکاری کۆن لە ڕێگەی ڕووبە ڕوو بوونەوەی ڕاستەوخۆوە تیایدا سەرکەووتوو نەبوون .

## ٨-گەڕان بەدوای جێگرەوە (البدیل) دا

باشترە بۆمان توێژینەوەی دۆزی ئافرەت لەنێو بازنەی مێژوویی و مرۆییەکاندا بکەین، بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەین گرفتی ئافرەت گرفتێکی مرۆییانەیە و شەقڵی تایبەتی خۆی هەیە.

لە گەڵ ئەوەش دا گەرەکە تۆزێ پاشکۆیەتی ئیدراکی لەخۆمان بتکێنین و بەدوای چارەسەری گرفتەکانماندا بگەڕێین لەنمونەی مەعریفیو مەنزومەی بەهاو ڕەوشتی و باوەڕبونمان بە مرۆڤایەتی هاوبەشمان بەدی بهێنین.

کە ئەوانە چەند مەنزومەیەکن جەخت لەسەرئەوە دەکەن کەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە پێش تاکەوەیە (بەتەواوی هەروەك مرۆڤ پێش (سروشت/ماددە) دەکەوی).

بۆیە لەجێی باس کردن لە ((مافەکانی مرۆڤ))ئەو مرۆڤە سروشتی‌یەی کە ڕۆسۆ باسی دەکات و بەپێی یاسا سروشتی‌یەکان دەژی و ناچارمان دەکا باس لە(مافەکانی ئافرەت) ی تاك بکەین و پاشان لەدوای دا (مافەکانی منداڵ)ی تاك، باشترە بۆمان باس لە (مافەکانی خێزان)بکەین وەك خاڵێکی سەرەتایی کە پاشان و دواتر لق و پۆپی ((مافەکانی تاك)) ی لێ دەبێتەوە کە ئەو خێزانە پێك دەهێنن، واتە بە هەموو دەست پێ ئەکەین (مرۆڤی کۆمەڵایەتی) پاشان بەشە (تاکەکان) بەدوایدا دێنین.

ئەگەر شوێنی ئەم نموزەجە بکەوین و خێزان بکەینە خاڵێکی سەرەتاو یەکەیەکی شیکاری، ئەوا باس لە(سەلماندنی خود بەشێوەیەکی ڕەها) دەبێتە مەسەلەیەکی قوت نە چوو پەسەند نەکراو دەبێت و باس لە (سەلماندنی خود لە خێزان دا) شوێنی دەگرێتەوە.

وە لە جێی باس کردن لە (ئازادکردنی ئافرەت) بۆ ئەوەی (خودی خۆی بسەلمێنێ) چێژو خۆشی‌یەکانی بەدی بێنێت، لەوانەیە بەکەڵك تر ئەوە بێت کە خوێندنەوەی دەورو بەرمان بکەین بۆ ئەوەی ئەوە بدۆزینەوە کە قەیرانی ئافرەت لەڕاستی‌دا بەشێکە لە قەیرانی مرۆڤی هاوچەرخ،کە لەو بزاوتە زەبەلاحەوە هەڵدەقوڵێ و پەیوەستە بە زیاد بوونی تێکڕای بەکار بردنەوە و ڕەنگی داوەتەوە لەئاوازی ژیانی نوێماندا. وە لە بوونی ئەو چەندان هەڵبژاردنە بەکار براوە لە ژمارە نەهاتوانەوەیە کە چواردەورمانی تەنیوە و جوڵەمانی سنوردار کردوە.

---

* ئەلتەرناتیڤ (وەرگێڕ)

لە ڕاستیدا توێژینەوەیەکیلەسەر خۆ ئەوەمان بۆ دەردەخا کە گرفتەکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە پیاو بەتەواوی بە شێوەیەکی زیاد ڕەوانە (مۆدێرنە) کراوە بەتەواوی لە خۆ گیراوە لەو بزاوتە بەکار براوە سەرکوێرییەدا بەشێوەیەك (بەدیل) ەکانی پێش دەستی زۆر زیاترە لەو بەدیلانەی کە خراوەتە بەردەستی ئافرەت.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بزاوتە بەکار بەرە پەرگیرییە (الاستهلاكية المتطرفة ) یەکێکە لە هۆکارەکانی قەیرانی مرۆڤی نوێ ، لەوانەیە باشتر و ژیرانەتر ئەوەبێ بانگەشە بۆ ((ئازادی ئافرەت)) نەکەین و هەوڵ نەدەین ئەویش فڕێ دەینە جیهانی بازاڕ و بزاوتی بەکارییەوە ، لەجێ ی ئەوە داوای سنوردار کردنی پیاو یا کەمێك سنور لەڕێی خۆی و بزاوتەکەی دا بکەین بەشێوەیەك جوڵەی لەسەرە خۆتربێ و کەمێك دابڕنین لە جیهانی بازاڕو بەکاربردن و بەمەش ئاوازەکەی ساز دەبێ لەگەڵ ئاوازی خێزان و سنوری مرۆڤایەتی هاوبەشمان.

لەم ڕوانگەیەوە دەبێت پیاو فێربکرێتەوە بە شێوەیەك هەندێ لێزانینی باوکایەتیو ژیان لە نێو خێزان و کۆمەڵ دا بە دەست بهێنێ ، چوونکە مرۆڤی نوێ لە گەڵ داخورانی خێزان و بزافی زیاد ڕۆیانەی بواری گشتی ئەم لێزانینیانەی وون و لە بیر کردووە.

بەم ڕێگەیە لە توانای پیاو دا دەبێت بەشداری پێگەیاندنی منداڵ بکاو لە نزیکەوەش ئاشنای ئەو کۆششە بێت کە(ئافرەت/دایك)ئەنجامی دەدا ، ئیتر لێرەوەش دەکرێ مرۆڤایەتی بوونی هاوبەشمان جارێکی تر خۆی جەخت بکاتەوە.

ئەمەش ستراتیژییەتێکە زۆری جیا نییە لە ستراتیژیەتی کۆمەڵەکانی ژینگە پارێزی (سەوز)، ئەوان داخوازی دەکەن لە مرۆڤی ڕۆژاوایی کە کەمێك لە گوڕو تینی کۆمەڵگا ڕۆژاوایەکان کز بکاو کەمێك خۆ دارنن لە ئایدۆ لۆژیایی پێشکەوتن و داگیرکاری و بەدەست هێنان و بەرهەم هێنان و لە جێی ئەوە ئایدۆلۆژیای پێکەوە هەڵکردن و هاوسەنگی لەگەڵ سروشت و خودو تێر کردنی پێداویستییە سەرەکییە مرۆییەکان جێی بگرێتەوە بە شێوەیەك ئاوازی کۆمەڵگە سازو گونجاو بێت لەگەڵ ئاوازی مرۆڤ دا.

لەوانەیە سودوو کەڵك لەوەدابێ باس لە ((مافی کار نەکەین بۆ ئافرەت))(واتە کار بکا لە بواری ژیانی گشتی لە بەرامبەر کرێ دا) واتە کارێکی بەرهەم هێنی ماددی کە سەر دەکێشێ بۆ بەرهەمێکی ماددی(شمەك و خزمەت گوزارییەکان). وە دیدو تێڕوانینی خەڵکیدا ڕێژینەوە بە شێوەیەك پێناسەیەکی تری کار بکاو کار ببێتە (کارێکی مرۆیی) واتە لە ڕووی مرۆییەوە بەرهەم هێن بێت (بەمەش جەخت دەکەینەوە لە سەر لە پێشێتی مرۆیی بە سەر ماددی و

سروشتیدا ). لێرەوە دایکایەتی ئەبێتە گرنگترین ((کاری بەرهەم هێن)) (چی لەوە گرنگترە منداڵێکی سروشتی بگۆڕێ بۆ مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی) ؟ لەم دیدەوە ئافرەتی کارای ماڵ کەمتر هەست دەکات بە نامۆی بێ نرخ کردنی کارەکەی و پیاویش ڕێزی زیاتری لێ دەگرێ و خەڵکیش واز لەو قسەیە دێنن کە ئافرەتی کارای ماڵ کار ناکات ، یا کۆمپانیایەکی گەشت و گوزاری گرنگ و بەنرخ تر بێت لە پێگەیاندنی منداڵ!

لەوانەیەبەمە چەندان ڕێگەی نوێ بدۆزینەوە بۆ سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی خێزانێکی پان و پۆڕ بەو ئارامییەی بۆ مرۆڤی بەدی دێنێ لە نێو شاری نوێ ی ڕێگا هەوراز و ئاوازە ترسێنەرەکان دا ، وەك ئەوەی گەشە بە جۆرێك لە بیناسازی وەها بدەین کە دراوسێتی چالاکتر بکات وەك دەزگایەکی ناوەند کە لە پیشەکەیدا بە خێزانێکی پان وپۆڕ بچێ .

ئەکرێ بگەینە کارێکی ڕۆژانەی وا کە بگونجێ پارچەپارچەو بەش بەش بکرێ تا لەگەڵ دەزگای خێزان دا بسازێ و دژ نەوەستێ لەگەڵ هەوڵەکانی ئافرەت لەوەی هەستێ بە ڕۆڵی خۆی وەك دایك و ژنێ ، بەڵکو ئەکرێ خودی بوارەکانی ژیان و جێگەی کاری بە شێوەیەك ڕێك بخرێ لە نێوانی دا بواری مرۆیی بسازێنرێ .

دەشتوانین ئابووری خێزان جارێکی تر بژێنینەوە (بە ئینگلیزی: فامیلی إیکۆنۆمی ) Family economy کە توانا و لێوەشاوەیەتی خۆی سەلماندووە لەسەر بەردەوامێتی و بەرهەمداریێتی باڵای لە کۆمەڵگا نوێییەکان دا ، ئەوانەی کە پێیان دەوترێ ((پێش کەوتوو)) (جا لە یابان بن یا وولاتە یەکگرتووەکان) .

بەڵام ئەوەی جێی گرنگی پێ دانمانە ئەوەیە کە ئەمەش شێوازێکە لە شێوازەکانی بەرهەم هێنانێکی وا کە خێزان ناپوکێنێتەوە هەڵیناوەشێنێ و ئەکرێ ئافرەت بەشداری تێدابکا بێ ئەوەی ناسنامەی خۆی وەکو دایك و هاوسەر لە دەست بدا .

هەروەها دەکرێ گەشە بە سستەمێکی فێرکاری نوێی وا بدرێ کە بگونجێ ئافرەت فێربێت و بەردەوامیش بێ لە زانست وەرگرتن دا بێ ئەوەی لە ناخیدا ڕاپایی بۆ دروست کەین لە نێوان حەزێکی باشی فێربوون و هەواداری‌یەکی گەردوونی بۆ دایکایەتی .

ئەم پێشبینییە بەراییانە ئامانجی کەم کردنەوەی ئەو بار قورسییە دەروونییەیە کە لە دایکایەتییەوە سەر هەڵ دەدا و ڕزگارکردنی ئافرەتە لە هەندێ لەو بار قورسییە لاشەییەی لە ماڵ دا بۆی دروست دەبێ ، بە شێوەیەك بوارێکی تایبەتی بە خۆی بۆ برەخسێنین کە بتوانێ

مرۆییانەی خۆی تیادا پیادە بکا بێ ئەوەی ناچار بێ بە تێکدانی خێزان و وە بێ ئەوەی سەلماندنی خودی مەرج دارکا بە وازهێنانی لە خێزان و ڕۆڵە کۆمەڵایەتی‌یەکەی .

وە پێویستە هاوکات لەگەڵ ئەمەدا توێژینەوەیەکی جیدی و قوڵ و ڕەخنەیی و داهێنانکاری ئەنجام بدرێ بۆ دیاردەی ئازادکردنی ئافرەت لە ڕۆژاوا و لە نێو چوار چێوەی ڕێ نمونی ماددی و چوار چێوەی فیکری ماددی ململانێ کاری تاك ڕەهەندی چەق بەستوو بە دەوری مێینەدا . هەر بۆ نمونە ئەکرێ توێژینەوەیەك بکەین سەبارەت بەو گرفتانەی لە داخورانی خێزانەوە سەر هەڵ دەدەن و تێ چوونە کۆمەڵایەتی و ماددی‌یەکانی بخەینە ڕوو .

لە یەکێك لەو توێژینەوانەدا خوێندمەوە کە پاشە کشەی ئافرەت لە خێزان و ئیستیعاب کردنی لە نێو ئامرازەکانی بازاڕ و بزاوتی بە کار بەری و گۆڕینی بۆ ((وزەیەکی کارا – طاقة عاملة)) لە بواری ژیانی گشتی دا و ((لە یەکەیەکی بەرهەم هێنانی)) بازاڕی کاردا سەر ئەکێشێ و بۆ نامۆبونێکی زۆر لای مندالآن بە شێوەیەك کە دەیان کا بە چەند ڕەگەزێکی وێرانکەر . توێژەری خاوەن باسەکە وا دەبینێ کە کردەکانی تێکدانی دەست ئەنقەستی خوێندنگاکان (School vandalism)چەندەها بلیۆن دۆلاری تێ دەچێ و ئەمەش بە تەواوی پەیوەستە بە دیاردەی نەمان و وون بوونی دایك . هەروەها دەکرێ حسابی ئەو زیانە دەرونیانەی منالّ بکرێ ، کە گونجاوە لە ڕووی ماددییەوە وەری گێڕینە سەر ژمارە . وە ئایا دەکرێ بەرزبوونەوەی ڕادەی تەڵاق ببەستینەوە بە ڕادەی پاشە کشەی ئافرەت لە خێزان و لە ڕۆڵی دایکایی‌یەتی ؟

هەروەها (جیابوونەوە (طلاق) لە وولاتە یەکگرتووەکان دا چەندان بلیۆنی تێ دەچێ ) ، هەروەکو زانراویشە کۆمپانیاکانی داین کاری (شرکات التأمین) بەشەکانی دابینکاری (اقساط التأمین) لەسەر ئە کەسە هەڵ دەگرێ کە جیا بوو بێتەوە چونکە بە ژمارەیەکی زۆرتری ڕووداو هەڵ دەسێ .

لێرەش دا دەکرێ ئاماژە بەو دیاردەیە بکەین کە بە دیاردەی ((بە مێینەکردنی هەژاری تأنیث الفقر)) ناو دەبرێ (Fiminzation of poverty ) ئەوەی لە وولاتە یەکگرتووەکان دا بووتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ناسراو ، هەروەکو بە دەردەکەوێ لە چوارچێوەی ئازادی نێوان ئافرەت و پیاودا ، پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێك دەژیەت و بە شێوەیەکی ئاساییش منالّێ یا دوو منالّی لە پیاوەکە دەبێ ، بێ ئەوەی پەیوەندی خێزانداری (عقد الزواج) پێکەوەی بەستبێتن . لە

پاش ماوەیەکی کورت یا درێژدا پیاوەکە تووشی بێزاری دەبێ و پیاوەکەش جەنگ و شەڕ لە نێوان هەردوولادا بەرپا دەبێ و پیاوەکەش بڕیاری ئەوە دەدات ((خودی بسەلمێنی)) لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزان داو شت ومەکەکانی هەڵ دەگرێ و دەڕوا (ئافرەتەکەش ) کە دایکە بە تەنها بە جێ دەهێڵێ بۆ چاودێری کردنی منداڵەکان . ئەمیش بار قورسی‌یە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری‌یەکانی زیاد دەبێ و (هەرچەندە پیاو نەفەقەش بدا) و پیاوانیش خۆشی و بزاوتە بە کار بەری‌یەکانیان زیاتر دەبێ، واتە بە مێینەکردنی هەژاری بەدی دێت ، دەشکرێ ئەوەش زیادکەین کە هەوڵی دەروونی و بێزاری‌ی لاشەییش بە مێینەکراوە .

لەوانەیەئەمەش لە گرنگترین هۆکارە سۆسیۆلۆژی‌یەکانی زیادبوونی ڕادەی سوحاق بێ لە کۆمەڵگا ڕۆژاوایی‌یەکان دا چونکە ئەمەش چارەسەری زەرورەتی بەتاڵ کردنەوەی ووزەی سێکسی ئافرەتە بێ ئەوەی بچێتە پەیوەندی‌یەکی بەردەوامەوە لەگەڵ پیاودا کە دەیخاتە باری تیاچوون و هەژاری و ئازار و داڕانەوە .

هەروەها دەکرێت توێژینەوەی بەرهەم داری کۆمەڵگا بکەین وەکو هەموو ، لە چوار چێوەی دەرچوونی ئافرەت بۆ کار لە نێوەندی ژیانی گشتی لە جێی کار لە نێوەندی ژیانی تایبەتی دا .

هەندێ توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە بەرهەمداری کۆمەڵگا لەسەر ئاستی (الماكرو) زیاد دەبێت لەگەڵ ڕۆڵ بینینی ئافرەت وەکو ژن و دایک ، چوونکە ئافرەت هەڵدەستێت بەپەروەردەکردنی مناڵەکان بە پەروەردەیەکی چاك و دواتریش دەبنە ئەندامێکی بەرهەم دار لە کۆمەڵگادا ، هەروەها ترس و ماندووبوونی هەموو هێندی دەکاتەوە مێرد و کوڕەکان کاتێ لە بواری ژیانی گشتی دەگەڕێنەوە و هەمووان هاوسەنگیان بۆ دەگەڕێتەوەو بەرهەم داریان زیاتر دەبێت.

هەندێ توێژینەوەش ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کە دڵە ڕاوکێی ئافرەت سەبارەت بە ناسنامەو خودی خۆی زیاد دەکەن لەگەڵ لەدەست دانی پیشەو پلەو پایەی خۆی وەکو دایك و ژنێك ، وە ئەم دڵە ڕاوکێ یە وەڵام دانەوەیەکی زۆر سەلبی دەبێ بۆ سەر تەندروستی دەروونی ئافرەت و سەلماندنی خودی ، وەهەرئەمەشە سەردەکێشێ بۆ هەوڵ دانی ئافرەت تا بەشێوەیەکی زۆر ناشایستە خۆی بە پیاو بچوێنێ و (uni-sex) بەدەر بکەوێ .

هەروەها پێویستە شوێنەواری هەر پرۆژەیەکی ئابووری بەرهەم هێنانی لە پێش چاو بگرین لەسەر بنیاتنانی خێزان و ڕۆڵی ئافرەت وەکو دایك ، ئێستاکە قسەکردنێکی (جیهانی) هەیە سەبارەت بە (خصخصە) هیچ کەسێکیش لە شوێنەواری (خصخصە)ی نە توێژیوەتەوە لەسەر

ئێمە وەکو مرۆڤ و تێ چوونە مەعنەوی و ماددیەکانی (لەگەڵ ئەوەی تێچوونە مەعنەویەکەش پاش کەمێك خۆی وەردەگێڕیتە سەر تێچوونێکی ماددی کەدەکرێ دوای هەندێ کۆشش چەندێتی یەکەی دیاری بکرێ)

لەو بڕوایەدام (خصخصە) بێ بەند کاریگەری یەکی ڕووخێنەری هەیە لەسەر خێزان و لەسەر ئافرەت،(خصخصە): لە واقع دا فراون کردنی بواری بازاڕو ئامرازەکانی خواست و خستنە ڕووەو تا هەموو شتێ قووت بدات.

هەروەکو پێویستە ئەوەمان لەدەست نەچێ کە بەر هەڵستی زۆرێك لەو پرۆژانە بکەین کە پێیان دەوترێ پرۆژەی گەشەپێدان و بانگی دەوڵی فەرزی دەکاو لە واقیعی حاڵدا مەبەستی داڕووخان و تێکدانی دەوڵەتی نەتەوەیی و دەزگای خێزانە کە بەدیدی ئەوان گەورەترین کۆسپی (گەشەکردن و پەرەپێدانە) (واتا پێشکەوتنی ماددی بەچاو پۆشین لەنرخ و بەهامرۆیەکان هەرچەندە ناشایستەش بێ)

هەمان شت پیادە دەبێ بەسەر هەندێ لەو تەشریعاتانەی کەهەندێ ڕێکخراوەی (دەوڵی) دەری دەکەن و لە چوار چێوەی عەقڵیەتی بازاڕی ئازاد و (خصخصە)ی تەواوی هەموو شتێکدا دەخولێنەوە لەناو ئەمانەشدا لاشەو ڕووح و ویژدانی مرۆڤ . پێویستە لەسەرمان سوود لە لێزانین و هاوکاری‌یە دەولیەکان وەربگرین بەمەرجێ نەبێتە نوێڵی ڕووخاندن و بناغەی کۆمەڵگاکەمان لەبەر یەك هەڵوەشێنێت .

هەر لەم میانەیەشدا چەندان توێژینەوەی تر هەیە کەتایبەت مەندیەکانی ئافرەت ڕوون دەکەنەوە لە ڕووی توێکاری و وەزیفەی بایلۆجی‌یەوە ، پەیوەندی دارە بە پێکهاتەی کەسێتی و ناسنامەو ئاواتەکانیانەوە (ئەم جیاوازیانەش شایستەی تۆمار کردنن، چونکە بڕاڤی بەسەنتەر کردنی مێینە جەخت لەسەر سەنتەرێتی لاشەی مێینە دەکاتەوە لەکاتی دەستنیشان کردنی ناسنامەیدا و پاشانیش بارەکە بەوە کۆتای پێدێنن کە هیچ گرنگی یەك لەلاشەو تایبەت مەندی توێکاری و وەزیفەی بایلۆجی‌دا نی‌یە ، بەتەواوی وێنەی بڕاڤی زایۆنزمە کە جەخت دەکات لەسەر جوولەکەیەتی و جوولەکەو پاشان دەیەوێ لەو جوولەکەیەتی‌یە ڕزگاریان بکات) .

ئێمە ئەو بۆ چوونەی ماددیەکانمان نی‌یە کە دەڵێن لاشەی ئافرەت قەدەرێتی و تایبەت مەنیە توێکاریەکانیشی بریتی‌یە لەسەرەنجامی حەتمی ئەو ، بەڵکو دەڵێین لە ڕاستی دا ئەم لاشەو تایبەتمەندی‌یانەی ئافرەت چەند سنوورێکی دیاری کراوی لەسەر فەرز دەکەن و ئەم

سنوورانەش بوارێکی مێینەیی تایبەتی بۆدەڕەخسێنن کە لەپیاوی جیا دەکاتەوە بۆ ئەوەی دووره پەرێز بێت لێی .

زۆرێك لە بانگەشەکارانی بە سەنتەر کردنی مێینە تووشی هەڵچوون هاتن کاتێك یەکێك لە زانایان توێژینەوەیەکی بڵاوکردەوە کە تیایدا دەری دەخا زۆرێك لەو پاڵەوانە وەرزشکارانەی ئافرەت کە وەرزشیان کردووە بە پیشە ، سك پڕ نابن مەگەر دوای وەستانی چەند ساڵێك نەبێ لە وەرزش کردن ، یەکێك لە زانایانیش توێژینەوەیەکی ناوازەی بڵاوکردەوە کە هەندێ پەیوەندی هەیە ، (توێژەریش نەیتوانیوە بە ووردی دەست نیشانی کا) لە نێوان عادەی مانگانەی ئافرەت و ئەو عەرەقەی بن باڵی پیاو دەیرێژێ. سەرەڕای ئەوەی ئەم توێژینەوەیە توێژینەوەیەکی زۆر بەرایی‌یە لەگەڵ ئەوەش دا بزاڤەکانی بە سەنتەر کردنی مێینە هەوڵیان دا بەرهەڵستی بڵاوکردنەوەی ئەم توێژینەوەیە و چەندان توێژینەوەی تریش بکەن ، واتە ئاراستەی ئایدیۆلۆژی گوڕوتینی گەیشتووەتە ئەوەی هەوڵی ئینکاری کردنی ئەو ڕاستی‌یە زانستی‌یانە بدات کە بیردۆزەکەیان دەپوکێنێتەوە ، وەك ئەوەی لە قۆناغی ستالینی داین کاتێك پێویست بوو لەسەر زانایان بە هەموو هێزیانەوە ، ڕاستێتی دەستەواژەکانی ماددییەتی دیالێکتیکی (المادیه الجدانیه) بسەلمێنن !

هەروەك پێویستە توێژینەوەی ئەو ڕۆڵە کاولکاری‌یەی هەندێ لە کۆمپانیا ((جیهانی‌یەکان)) بکەین کە لە توێژینەوەیەکی پێشوتردا بە ((الفردوس الأرضي – ١٩٧٩ – فیردەوسی زەمینی*)) ناووم بردووه و (ئیمپریالیەتی دەروونی) پێك دەهێنێ . لە کاتێکدا ئیمپریالیەتی تەقلیدی بەردەوام بە دوای بازاڕدا دەگەڕێ بۆ بازاڕی شمەکەکانی و کرێکاری هەرزان بەها ، ئەوا ئیمپریالیەتی دەروونی زۆر لەمە جیا نی‌یە ، مەگەر ئەوە نەبێ کە ئەم هۆشیاری ویژدانی مرۆڤ بواری بزاڤ و چالاکیەتی ، واتە ئەم لە بواری ژیانی گشتی زەمینی‌دا ناجوڵێ و بزاوتی نی‌یە ، بەڵکو لە بواری ژیانی تایبەتی جەووانی‌دایە (الجوانیه)* کە ئەمەش بازاڕێکە و دەکرێ بۆ هەتا هەتایی سنوورەکەی فراوان بکرێ ، لە ڕێگەی فراوان کردنی ئارەزووەکانی مرۆڤ و بەرهەم هێنانی دۆخێك لە ڕاڕایی و ناهاوسەنگی و ناڕازی بوون لە ناخەوە ، وا دەبینێ کە ناتوانێ ئەم بارانەی تێپەڕێنێ مەگەر لە ڕێگەی کڕین و بە دەست خستنی شمەکێکی دیاری

---

* ((بەهەشتی زەمینی – وەرگێڕ))

* جیهانی هەست و سۆز و ویژدان

کراوەوە نەبێ .(لەم بوارەش دا) چەندان پیشەسازی دروست بوون (کە سەرمایەکانیان بلیۆنەها دۆلارە)و بە تەواویش جەختی لە سەر ئافرەتە .

کۆمپانیاکانی ئامادەکردنی جوانکاری و ئامرازەکانی، ئافرەتی کردووەتە ئامانجێکی سەرەکی خۆی . لە ڕێگەی هەزارەها ڕیکلامەوە* ، لە ئافرەت دا ئەو هەستە بەدی دێنن کە ئەو ئەگەر ئەو هەزاران بۆ درەو بۆن و کرێمانە بە کار نەهێنێ ئەوا سەرنج ڕاکێشی (نەریتی سێکسی) لە دەست دەداو دەبێتە کەسێکی ناشرین و قێزەون .

لە پاش ڕیشەدار بوونی تەواوی ئەم قەناعەتە لە ویژدانی مێینەدا ، ساڵانە ئەو بۆدرانە (مساحیق) گۆڕانیان بە سەردا دێ ، دەخوازێت لە ئافرەت ڕووی خۆی بگۆڕێ بۆ ئەوەی ((بەردەوام نوێ بێ)) (بەردەوام داخوازی لەسەر بێ) ، بەم شێوەیە ئافرەت دەبێتە بازاڕێکی هەمیشە نوێ بە شێوەیەکی ناکۆتا .

دڕندەیی پیشەسازی ڕازاندنەوە و خۆ نمایش کردن هیچی کەمتر نییە لە ئامادەکارییەکانی جوانکاری ، ئەمیش پیشەسازییەکە و چەندان کەناڵی ئاسمانی و ئەستێرە و پاڵەوانی هەیە (زۆرینەیان لە نەشازە سێکسییەکانن و لە یەک ساڵ دا بە هۆی ئایدزەوە پێنجیان مرددن و پیشەسازی نمایش کردنیش سەرکەوتوو بوو لە شاردنەوەی هەواڵەکە بۆ ئەوەی کاریگەری نەبێ لەسەر فرۆشتنەکانیان) .

لە زۆر کات دا پێشەنگا ئارایشتە ڕازاندنەوەکان نزیک دەبنەوە لە بەرەڵایی ( إباحية )ی تەواوەوە ، ئەوتانێ زۆر هونەرکاری دەکەن لە سەر شاردنەوەی کەسێتی مرۆیی و کۆمەڵایەتییانەی ئافرەت و بە دەر خستنی جێ سەرنجەکانی لاشەی تاوەکو بیکەنە لاشەیەکی (سروشتی/ماددی) ، بازاڕێکی گشتی کە تایبەتمەندی نییە و دەکرێ شکستی پێ بێنێ و وەگەڕی خەیت و بیکەیتە هۆکارێك .

بەم شێوەیە لاشە و ڕووی ئافرەت لە چوارچێوە ماددییەکەیدا ڕێ نیشاندەری دەکرێ و لە جیهانی ژیانی تایبەت و هێمنی و ئارامی ڕادەکێشرێتەوە جیهانی ژیانی گشتی و بازاڕ و گورگە لەقێ و ڕاڕایی .

ئەوەشی زیاتر قووڕەکەی خەست تر کردووەتەوە ئەوەیە پیشەسازی بۆدرەکانی خۆ جوان کردن و ئامرازەکانی نمایش چەند پێوەرێکی (جەمالی) جوانکاری وەها فەرز دەکەن کە پابەند

---

* اعلانات – و –

بوون پێیانەوە بە هیچ شێوەیەك ناكرێ مەگەر بۆ كۆمەڵێكی سنووورداری مێینـە بێ كـە بۆ لاشەیان خۆیان یەكلا كردووەتەوە (وێنـەی كارەكتـەرەكان و نمـایش كـارانی جل و بـەرگ و رازاندنەوەكان ، یا كچانی رێكلامەكان) ئەمـەش بووەتە هۆی بڵاوبوونـەوەی چەندان نەخۆشـی دەروونی وێنەی نەخۆشی (انارکسیافورموزا ، ئەمەش هەستێكە تووشی ئافرەت دەبێت و ژێر دەستی دەكا بـەوەی هەرچـەندە زۆر جوان و چوست و چالاك و رێك بێ وا هەسـت دەكـا زۆر ناشرین و ورگنە ، هەر بۆیە واز لە خواردن دەهێنێ بە هۆی ئەو راپاییـیە زۆرەی سـەبارەت بـە كێش و جوانییەكەی هەیەتی وە لە هەندێ كات دا بە مردن كۆتایی دێ .

وەهـاش بـە دەر دەكـەوێ ئـەم نەخۆشـییە لـە ئاستێكی فراوان دا بڵاوە (ئەوترێ ئـەمیرە دیانـا هەندێ كات بەو نەخۆشییە تووش بووە) .

وێنەی ئەم باس و خواسانەش چەند لقێكی نوێی كۆمەڵناسی وەكو سوسیۆلۆجیای ڕوو ، سۆسیۆلۆجیای لاشە لە زانستی كۆمەڵناسیدا باسی لێ دەكەن .

پیشەسازی ڕیكلامیش پشتیوانی ئەم بە هۆكار كردنەی ئافرەت دەكا و بـواری ئیمپریالیـەتی دەروونی فراوانتر دەكا ، ئەمەش ئافرەت بەكار دێنێ بۆ بەرزكردنـەوەی حـەز و ئـارەزووە بـەكار بەرییەكانی هەریەكە لە پیاو و ئافرەت و دووبارە بەرهەم هێنانەوەی وێنەی ئافرەت بەو پێیـەی لاشـەیەكی مـاددی ڕووتـە و دانـراوە بۆ حـەزە ماددییە ڕاستەخۆكان پاشـان دواتـر پیشـەسـازی سینەما لـە وڵاتـە یـەكگرتووەكاندا (هولیود) دێ و جـارێكی تـر وێنـەی ئـافرەت لـە ویژدانـی هەمووماندا دادەڕێژرێتەوە و هەموو پیرۆزییەكی لێ دەردێنێ و ڕووتی دەكاتـەوە نـەك تـەنها لـە جلـەكانی ، بـەڵكو لـە هەسـتی مرۆییانـە و پێكهاتـە ژیـاری و كۆمەڵایـەتی و تایبەتمەندییـە ڕۆشـنبیرییەكانی ، بـە شـێوەیەك دەبێتـە وێنـەی ئـەو مرۆڤـەی لـە لایـەن سسـتمی نـوێی جیهانییـەوە پێشـنیار كـراوە: مرۆڤێكـی بـێ یـادەوەری و هـۆش ، مرۆڤـی سـەردەمی پـاش نوێگەری و [illegible] جیهانەی بێ چەقە (یەكێك لە بەڕێزەكان) زاراوەی ((پاش بیكینی – ما بعد البكيني)) بە كار[illegible]ناوە ( كە بە ئینگلیزی: پۆست بكینی – Post bikini ) پێی دەوترێ لەسـەر هـەمان بـە كارهێنـانی پـاش نوێگـەری (بـە ئینگلـیزی پۆسـت مۆدێرنسـت Post modernist)بۆ ئەوەی ئاماژە بكا بەوەی ئەم ئاراستەیە ڕوو لە ڕووت كردنەوە و داماڵینی هەمە لایەنەیە و تێڕوانینمان ڕووە و ئەو پەیوەندییە ئاراستە دەكا كە لە نێوان ڕووتكردنەوەی ئـافرەت لـە جلـەكانی و ڕووتكردنـەوەی مـرۆڤ لـە مەنزومـە بـەهایی و تایبەتمەندییـە

نەتەوەیی‌کانیدا هەیە ، وە لەوانەیە بە کەڵك بێ ئەگەر پەیوەندی‌یەك ببینینەوە لە نێوان بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە و چەمکە شاراوەکانی ناوی ، بە پرۆسەی بازاڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەند ، هەریەکەیان دوژمنن بە مێژوو ، وە هەریەکەشیان دەخوازن لە مرۆڤی عەرەبی ڕابردوو هۆشی خۆیان لە بیردەکەن و لە نوێ وە دەست پێ دەکەن ،

وە لەوانەیە بە کەڵك بێ ئەو پەیوەندی‌یەش هەست پێ بکەین کە لە نێوان بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە و چەند دیاردەیەکی نوێی کۆمەڵگەکەماندا هەیە وێنەی گرنگی پێدانێکی گەرم و گوڕ لە لایەن هەندێ لەو ڕۆژنامە و گۆڤارە میسری‌یەکان بە سێکس و بەکارهێنانی زمانی عامی میسری لەو بڵاوکراوانە و لە ڕێکلامەکان دا .

ئەو سێکسەی ئەو بڵاوکراوانە تاوتوێی دەکەن بارێکی مرۆییانەی پێکهاتە و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مرۆیی نی‌یە ، بەڵکو بۆ کات بە سەر بردن و ئابڕو تکانە واتە بریتی‌یە لە کردەیەکی دەرهێنانی پیرۆزی لە مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە بابەتێکی سادە و دەستەمۆ نەك بوویەکی پێکهاتەی مەزن . لەم چوار چێوەیەش دا ئابڕوو چوونەکانی ئەستێرە سینەمایی‌یەکان و ژیاننامە خودی‌یە بۆگەنەکانیان لە گرنگترین هەواڵ و وێنە مەجازی‌یە سەرەکی‌یەکانە ، لێرەشەوە مرۆڤ لە ژیاننامەی فلانی سەماکەردا دەتوێتەوە کە هیچ شتێکی لە ژیانی‌دا ئەنجام نەداوە جگە لە زنجیرەیەك شووکردن و ژمارەیەك لە ئابڕوو چوون نەبێ.

بە کارهێنانی (عام)یش زۆری لەمە جیاوازتر نی‌یە ، جا ئەگەر عامی بوون بە تەنها قوڵگەی یادەوەری‌یە مێژووی‌یەکانمان بێ ، ئەوا أمرؤ القیس و بوحتری و ابن خلدون و ابن سینا* لە دەست دەدەین ، واتە هەموو شتێکمان وون کردووە ، بەمەش کلاسیکی بوونمان بریتی دەبێ لە گۆرانی شکو و وتەکانی اسماعیل یاسین .

لەو بڕوایەدام ئەو مرۆڤەی چاو لە فلان سەماکەر دەکا و هیچی یاد نایەت جگە لە هەندێ فلیم و گۆرانی میسری‌ی نەبێ ، ئەوا دەبێت بە مرۆڤێك کە بە تەواوی پووچ کراوە و هەڵوەشێنراوەتەوە ، لێرەوەش دەتوانێت زۆر بە لێوەشاوەییەکی بەرزەوە لە بازاڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەندا بزاوتی هەبێ ، چونکە بازاڕی عەرەبی خوازیاری مرۆڤێکی تری خاوەن ناسنامە و یادەوەری و هەڵگری مەنزومەیەکی بەهایی‌یە . لە ڕاستی‌دا بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە بریتی‌یە لە بەشێك لەو هێرشە گشت گیرەی دژ بە بەهاو یادەوەری و هۆشیاری و

---

* دیارە دکتۆر المسیری وەکو عەرەبێك لێرەدا دەدوێ و ئەو لایەنەش بە دەردەخات – و –

تایبەتمەندیی‌یەکانمانە و پێویستە هەست بەوە بکەین و تێ بگەین ، تاوەکو جەنگەکەمان لاوەکی نەبێ و لە خودی خۆیدا ناهۆشیار نەبێ.

## کۆتایی

هەموو ئەمانە بیروبۆچونێکی تا ڕادەیەك بنەمایی (مبدئي) بوون ، بە تەنها هێڵە گشتیی‌یەکان ، بەڵام ئەوەی سەرجەمیان کۆدەکاتەوە ئەوەیە کە خاڵی بەرایی و یەکەی شیکاری بریتی‌یە لە مرۆڤی کۆمەڵایەتی نەك مرۆڤی سروشتی ، کە ئەوەش خێزانە ، نەك کەسێکی سەرکەشی بە تەنهای وا کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن ڕای دەماڵن و دەزگا گەورەکان دەیبزوێنن .

هیوا خوازم لەقسەکانمدا وا تێ نەگەم کە من دان نانێم بە بوونی دۆزی ئافرەت لە کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامیی‌یەکانماندا ، وە چەند پلەیەکی جیاکاری هەڵاوێردن لە دژی ناگیرێتە بەر ، بەڵکو سەرکوت دەکرێ . من ئاگادارم (بەو پێیەی مامۆستای کۆلێژی کچان بووم بۆ ساڵانێکی درێژ) کە چەندان گیروگرفتی توندوتیژو قوڵی وا هەیە ، کە خوازیاری چارەسەرێکی خێرا و ڕیشەیی‌یە ، هەروەها خوازیارم هیچ کەسێکیش وەها نەبینێ من خوازیاری ڕێگری ئافرەتم لە کاری ناوەندی ژیانی گشتی یا لە بریتی کرێیەکی نەختینەیی ، یا خوازیاری ئەوە بم سانسۆر (حجر) بخرێتە سەری لە ڕووی عەقڵی و عاتفی‌یەوە ، هەموو ئەوەی داوای دەکەم باس و تاوتوێ کردنی دۆزی ئافرەتە لە ڕێگەی دۆزی خێزان و لە چوارچێوەی مرۆڤایەتی‌یانەی هاوبەشمانەوە ، وە خێزان (نەك ئەو تاکەی بە دووی چێژە تاکانەیی و بەرژەوەندی‌یە کەسی و بزاوتە بە کاربەری‌یەکانی خۆی بگەڕێ ) بریتی بێ لە یەکەی شیکاری و خاڵی لە سەر دووان .

هەر لێرەوە من خوازیار و داواکاری گەڕانەوەی ئیعتبارم بۆ دایکاتی و پیشەی ئافرەت وەکو دایك و ژن ، وە وا دەبینم ئەم پیشە ((مرۆیی))و((تایبەتە)) پێش هەر پیشەیەکی ((بەرهەمهێنانی)) و ((گشتی))ی تر دەکەوێ ، هەرچەندە ناشی سڕێتەوە .

هەروەك خوازیارو داواکارم چاودێری ئەوە بکرێ کە جیاوازی‌یەکانی هەردوو ڕەگەزەکە سەر نەکێشێ بۆ ئەوەی ببێتە بناغەیەك بۆ ستەم و جیاکاری .

کۆتایی ئەم ووتارە (مقالة)م دەهێنم بە ئاماژەکردن بۆ دوو ڕووداوی کورت: یەکێکیان لە ژیانی تایبەتیم و ئەوی تریان لە ژیانی گشتیم .

کاتێك خۆم و خێزانم (د. هدي حجازي) ڕۆیشتین بۆ وولاتە یەکگرتووەکان بۆ تەواوکردنی خوێندن لەو کاتەدا من لە گەورەترین بانگەشە و داخوازیکارانی ئازادی ئافرەتان بووم لە چوارچێوەی یەکسانییەکی وا کە لە پێك یەکسان بوون (تسوية) نزیك دەبویەوە . خێزانەکەم پەیوەندی کرد بە بەرنامەی ماستەرەوە و وام بە باش زانی بە تەواوی یەکلا نەبێتەوە بۆ خوێندن تا خوێندنەکەی لەگەڵ ئەرکەکانیدا وەك دایك ، دژ نەوەستێ . بۆیە ئەم پلە زانستییەی بە لە سەر خۆییەکی زۆرەوە بە دەست هێنا . (لە هەر فەسڵێکی خوێندن دا (مقرر)ێك یا دوو (مقرر)ی دەخوێند) .

بەڵام کاتێك هەڵی خوێندنی لە بەردەوام دا ڕەخسا بۆ ئەوەی پەیوەندی بکا بە بەرنامەی دکتۆراوە ، بارەکە یەکلایی بوونەوەی تەواوی دەخواست ، لێرەوە دەبوایە پشت بە هاوکارێکەبیەستێ بۆ منداڵەکان (بە ئینگلیزی بیبی سیتر baby-sitter)ی پێی دەڵێن بۆ ئەمە بەرگری زۆرم لێ نەکردوو داوام لێ کرد ئەم هەلە بقۆزێتەوە و هیچ کاتێك بەفیڕۆ نەدات (ئەگەر ئەوەی بکردایە ئەوا پلەی دکتۆرای بە دەست دەهێنا پێش ئەوەی بگاتە بیست و شەش ساڵ ، وە ژیانی پیشەیی گشتی خۆی Career لە سەرەتای تەمەنیەوە دەستی پێ دەکرد) .

بەڵام بە کت و پڕی پەسەندی نەکردوو ئەوەشی پەسەند نەکرد کەلە دەرەوەی ماڵدا کار بکا چونکە هەستی دەکرد کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان دایك و منداڵ ناکرێ بە درێژایی ژیان بریتی (تعويض) بکرێتەوە وە ئەم خوێندن و زانیارییەی ئەو ، منداڵەکەی لەوە بێ بەش دەکا کە مافی ئەوەی هەبێ هەرکاتێ بیەوێ بە خەبەر بێ و ساڵەکانی بەرایی ژیانی لە هێمنی و بەختیاری و هێدی بوون دا بە سەر بەرێ ، ئا لەو ساتەدا دەروونم بە خەبەر هات چونکە بە هۆی عەقڵییەتی بە دەست هێنانی (برۆمیثیة)و بەرهەم هێنانی (فاوستی)یەوە کە ئەو کاتە هەژمونیان بە سەرم دا هەبوو ئەم کارو بارە گەردونییە سادانەم هەست پێنەدەکرد ، منداڵەکە گەورەبوو ، هەریەکە لە دایك و منداڵیش دکتۆرایان بە دەست هێنان و مێژووش کۆتایی پێ نەهات .

بەڵام سەبارەت بە خۆم ئەزانم هەندێ سەرزەنشتم تووش هات هەروەك دەزانم گەیشتم بە زۆرێك لە دانایی .بەڵام ڕووداوی دووەم ، هەروەکو لە پێشەوە ووتم لە ژیانی گشتیدا بوو ، یەکێك لە خانمە ئەمریکییەکانم دەناسی کە لە پێشەنگەکانی بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە

بوو ، لە ساڵی ١٩٧٤دا سەردانی خۆم و خێزانەکەمی دەکرد ، پێی خۆش بوو کە یەکتر ناسی لەگەڵ پێشەنگەکانی بزاڤی ئازاد کردنی ئافرەتی میسرییدا بکا .

منیش پەیوەندیم کرد بە دکتۆرە (سهير القلماوي)یەوە — بەر بەزەیی خوا کەوێ — ئەویش بە سوپاسەوە ئامادەیی دەربڕی و ، هەموومان لە مێزی خواردن لە میوانداریەك دا پێك گەیشتین . پەیڤین لە نێوان خانمە ئەمریکییەکە ودکتۆرە (سهير) دەستی پێ کرد ، قسەمان لە سەر یەکسانی نێوان پیاو و ئافرەت ، وە لە سەر ئازاد کردنی ئافرەت کرد . دکتۆرە (سهير) ڕەزامەندی دەربڕی لە سەر قسەکانی تا گەیشتینە خاڵێك ئا لەو کاتەدا دکتۆرە سهير هەستی کرد کارەکە تەنها قسەکردن نییە سەبارەت بە ئازادکردنی ئافرەت بەڵکو وروژاندنێتی بەرامبەر بە پیاو و دابڕانێتی لێی . لێرەدا دکتۆرە سهير قسەکردنی لەگەڵ ئەودا بە زمانی ئینگلیزی وەستان و ڕووی لە من کرد و بە عەرەبی پێی ووتم: ئەم خانمە چی دەوێ؟ ئەگەر بە ڕاو بۆچوونەکەی ئەو بکەین ، ئەبێتە شتێکی موستەحیل جارێکی تر نێر و مێ پێکەوە کۆ بکەینەوە؟ پاشان بەردەوام بوو لە قسەکردن بە ئینگلیزی . ئەم قسە پوخت و سادەیەی ئەو ، جیاوازییە توندەکانی نێوان بزاڤی ئازاد کردنی ئافرەتان و بزاڤی بە سەنتەر کردنی مێینە بە دەردەخا و ئەوجیاوازییەش ڕوون دەکاتەوە کە لە نێوان کەسێ هەست بە مرۆییانەی هاوبەش و کەسێ پەسەندی ناکاو وە لە نێوان کەسێ کە وا دەبینێ کۆمەڵگە پێشینەی هەیە بە سەر تاك داو کەسێ خودی تاکی بە سەرەتاو کۆتا دەزانێ ، وە لە نێوان ئەوەی مرۆڤ دەخاتە پێش سروشت و ماددەوە و کەسێ پێچەوانەی ئەمەیەو وا دەبینێ کە مادده لە پێشی (الأسبقية) هەیە بە سەر هۆش و ژیار و ئاراستە کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکاندا ، خواش زاناترە .

# پێرست